ڕێبوار کەریم مەحمود

# پارتە سیاسییەکان و ڕای گشتی

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)
سلێمانی - گەرەکی سەرچنار - ١٢١
کۆلانی - ٤٤
ژ.خانوو - ١

www.hoshiari.org
govarynovin@yahoo.com

* ناوی کتێب: پارتە سیاسییەکان و رای گشتی

* نووسەر: رێبوار کەریم مەحمود

* نەخشەسازیو بەرگ: نەهمی جەلال

* تایپ:

* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

* چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٩

* ژمارەی سپاردن: (٢٦٥٤) ی ساڵی ٢٠٠٩ ی وەزارەتی رۆشنبیری

* ژمارەی زنجیرە: (٣٢٤)

* چاپ: دەزگای چاپو پەخشی حەمدی

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك). ساڵی ٢٠٠٩

# پێڕست

## پێشەکی:

لێکۆڵینەوە لە پارتە سیاسییەکان و ئەو بابەتانەی پەیوەستن پێوەی، لە زانستە سیاسییەکاندا دەچێتە خانەی لێکۆڵینەوە لەبواری سیستەمە سیاسییەکان. کە تیایدا پارتە سیاسییەکان وەك پێکهێنەرێکی بەهێزی نێو سیستەمی سیاسی وڵاتدا ئەژمار دەکرێن. هەر لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە لە پارتە سیاسییەکاندا چەندین پرسی پەیوەندیدار هەن، لە گرنگترینیان بابەتی رای گشتی و بەشداری سیاسی و گەشەپێدانی سیاسی و کۆمەڵگەی مەدەنی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ....هتد. لەرێی زانینی ووردی ئەم بابەتە پەیوەندیدارانەوە دەتوانین بەتەواوی زانینێکی مەعریفییانەی ووردمان سەبارەت بە پارتی سیاسی دەست بکەوێت.

ئەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا خراوەتە بەردەست خوێنەران بریتیەلە بەرهەمی چوار ساڵ وانەوتنەوەی پارتە سیاسییەکان و رای گشتی لە کۆلیجی یاساو رامیاری/بەشی زانستە رامیارییەکانی زانکۆی سلێمانی. هەربۆیە ئەو پێکهاتەیەی کە زۆرترین سوود لە زانیارییەکانی ئەم کتێبە وەردەگرێت ئەو خوێندکارانەن کە لە بواری زانستە رامیارییەکاندا دەخوێنن. بەتایبەتی کە زۆر کەم لەم سەرچاوە

زانستییانەی لەم بوارەدا و بە زمانی کوردی لەنێو کتێبخانە کوردییەکاندا دەبینرێت.

ئەو بابەتانەی لەم کتێبەدا خراونەتەڕوو لە چەندین سەرچاوەی زانستی کۆن و نوێوە وەرگیراون. ئەو سەرچاوە کۆنانەی کە بەکارهاتوون زیاتر ئەو سەرچاوە گرنگانەن کە لە لێکۆڵینەوە و خوێندنی پارتە سیاسییەکاندا لەسەر ئاستی زانکۆکانی عیراق و تەنانەت وڵاتە عەرەبییەکانیش وەك سەرچاوەی سەرەکی بواری لێکۆڵینەوەی پارتە سیاسییەکان پشتی پێدەبەسترێت. سەرچاوەکانیتریش، هەریەکە و بەپێی قەبارەی مەعریفی خۆی سوودی لێوەرگیراوە.

سوپاسی بێپایانی خۆم پێشکەش دەکەم بە هەموو ئەو دۆست و هاوکارانەی کاریان لە پێگەیاندنی ئەم بەرهەمە زانستییەدا کلادووە. هیواداریشین توانیبێتمان خزمەتێکی بچووکی زانستی بە پرۆسەی خوێندن لە کوردستان بەگشتی و زانکۆکانمان بەتایبەتی کردبێت و بتوانین لەم رێگەیەوە خوێندکارانی بەشی زانستە رامیارییەکان لەڕووی زانستییەوە سوودمەند بن. بەدڵنیاییشەوە لەم بەرهەمەدا کەموکوڕی هەر دەبێت بەڵام هیواداریـن کەمترین کەموکوڕی بەسەرماندا تێبپەڕێت.

- **پێناسەی پارتی سیاسی:**

هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی پارتە سیاسییەکانەوە بیرمەندان چەندین بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە پێناسەکردنی چەمکی پارتی سیاسی، هەموو ئەم هەوڵانەش لە توێژینەوە ئەکادیمی و زانستیەکاندا ئاماژەیان پێکراوە، بەڵام ئەوەی کە گرنگە، ئەوەیە کە زۆربەی لێکۆڵەران بۆچوونەکانیان لەیەکەوە نزیکن. بەمەبەستی ئاشنابوون بە مانای پارتی سیاسی، لێرەدا چەند بۆچوونێک دەخەینەڕوو:

لە قاموسی وشەی فەرەنسا. وشەی پارتی (parth)، سەرەتا خاوەن واتایەکی سەربازی بووە و بەدەستەیەك لەو سەربازانە دەگوترا، کە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن ئامادە دەکران، کە لە لەشکر جیادەبوونەوە و لەگەڵ دوژمندا دەجەنگان. (پارتیتۆ) لە زمانی ئیتاڵی و (پارتای) لە زمان و فەرهەنگی ئەڵمانی و وشەی (پارتی) لە زمانی ئینگلیزی، مێژوویەکی هاوچەشنیان هەیە. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا پارت بە واتای دەستە، گروپ. بەشێك لەشتێك و کۆمەڵێك لە بەرامبەر ئەوانیتردا، بەکاردێت.

بە بڕوای دکتۆر (سادق ئەلئەسوەد) خودی چەمکی پارت بەتەواوی ڕوون نەبوو، لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا چەمکی پارت تەنها ڕێبازە ئایدیۆلۆژییەکانی دەگرتەوە، نەك ئەو کەسانەی ئەو ڕێبازانەیان دەگرتەبەر. مارکس و لینینیش بوونە خاوەنی ئەو ڕێکخراوە سیاسییەی گوزارشتی لە بەرژەوەندییەکانی چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو دەکرد، دواتر لەماوەی نێوان (١٩٢٠-١٩٤٠)دا چەمکەکانی

نۆرستۆ کرۆسکی) و (رۆبێرتۆ میشال) و دوای ئەوانیش مۆریس دوڤرجی باو بوون. کە ئەمانە زیاتر بەلای ئەوەدا دەڕۆشتن. کە لەڕووی بونیادەوە و بەتایبەتیش لەڕووی ڕێکخستنەکانیەوە لە پارت بکۆڵنەوە. بەلام پاش جەنگی جیهانی دووەم ڕێبازی وەزیفەگەرایی پارت سەری هەڵدا، بەتایبەتیش لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

(ئەدمۆند بێرگ) دەڵێت: "پارت بریتیەلە دەستەیەکی یەکگرتوو لە پیاوان، کە دەیانەوێ بە هەوڵی هاوبەش و بەگوێرەی کۆمەڵێك پرەنسیپی دیاریکراو، کە لەسەریان ڕێکەوتوون، بەرژەوەندییە نیشتمانیەکانی خۆیان تۆکمە بکەن".

(حسێن جەمیل) کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی پارتی نیشتمانی دیموکراتی لە عێراق لە سالی ١٩٤٦. دەڵێت "چەمکی پارت بە مانا کۆمۆنیستییەکەی بریتیەلە پێشەنگی ئەو چینە چەوساوانەی هەوڵ دەدەن هەموو جۆر و شێوەکانی چەوسانەوە بنبڕ بکەن". هەروەها دەڵێت: "بەلام پارتی سیاسی بەمانا رۆژئاواییەکەی جۆرێکە لە چەندین جۆری ئەو گروپ و دەستەگەرانەی لە سایەی سیستەمە سیاسییە جیاجیاکاندا هەوڵ دەدەن دەزگای حکومەت و سیاسەتەکانی بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە".

(جەیمس مادیسون) دەربارەی پارتی سیاسی دەڵێت: "بریتیەلە کۆمەڵێك لە هاوولاتیان، چ زۆرینە بن یان کەمینە، ئامانجێکی هاوبەش یان بەرژەوەندییەکی هاوبەش یەکیخستوون لە بەرامبەر مافەکانی هاوولاتیانی تردا، یان بەرامبەر کۆی بەرژەوەندییە هەمیشەییەکانی کۆمەڵگە".

(لیـنین) کـە دانـەری بنـچینەکانی پـارتی سیاسـییە لـە روانگـەی ئایـدیۆلۆژیای چـەپەوە لـە وتارێکیـدا کـە لـە مـانگی تـشرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩١٢ لــە رۆژنامــەی (نفــسکایا زفــزدا)ی ســۆڤیێتی جــاران بڵاوکراوەتـەوە، ئامـاژە بـە فـۆرمی پـارتی سیاسـی راسـتەقینە دەکـات، بـەوەی کـە "بریتیەلـە چوارچـێوەیەکی رێکخـراوی کرێکـاران، کـە بـە رێکخــستنی پتــەو بـەیەکــەوە بەســتراونەتەوە لــەپێناو بــەدیهێنانی سۆشیالیزمدا).

لەلایەکیترەوە (کۆنستانت بێنجامین Constant Benjamin) پێیوایە "پارتی سیاسی بریتیەە کۆبونەوەی خەڵکانێك کە خاوەنی مەزهەبێکی سیاســی دیــاریکراون و بانگەشــەی بـۆ دەکـەن". بــەلاَم (فرانــسیس جۆرگویـل) پێناسـەی پـارتی سیاسـی بەمجۆرە دەکـات کـە "بریتیەلـە کۆمـەڵێکی رێکخـراو بـۆ بەشـداری لـە ژیـانی سیاسـی، یـان لەرێگـەی کۆنترۆڵی تەواوی دەسەلاَت یان وەرگرتنی بەشێکی دەسەلاَت، لـەپێناو بەدیهێنانی بیرو بۆچوون و بەرژەوەندی ئەندامەکانی". لە هـەمان کاتدا زانای بواری سۆسیۆلۆژیا و بیرمەندی سیاسی بەناوبانگ (جۆرج بیردۆ Gorge Burdeau) پێیوایە "پارتی سیاسـی کۆمەڵێك تاکن کە هـەمان تێــڕوانینی سیاســییان هەیــە، هەوڵــدەدەن بــۆ زاڵکردنــی بەســەر تێڕوانینـەکانی تـردا و زۆرتـرین هـاووڵاتی لە دەوری خـۆی کۆبکاتـەوە لەپێناو بەدەستهێنانی دەسەلاَت، یان لانی کـەم کاریگـەری خستنەسەر تێڕوانینەکانی دەسەلاَت".

سەرەڕای هـەموو ئـەم پێناسـانە، کۆمـەڵێك پێناسـەی دیکـە هـەن بـۆ پـارتی سیاسـی لـە گرنگترینیـان (تۆمـاس بـرک) دەڵـێ: پـارتی سیاسـی بریتیەلـە کۆمـەڵێك خـەڵك کـە یـەکیانگرتووە و بـە تواناکانیـان کـاری

هاوبەش ئەنجام دەدەن، کە لە بەرژەوەندی گشتیدا بێت و خاوەنی یەك پرەنسیپن". هەروەها (هانس کلسن) دەڵێ "پارتی سیاسی ئەو دەزگایەیە کە خەڵکێکی خاوەن هاوبۆچوون کۆدەکاتەوە بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەرییەکی ڕاستەقینە لە بەڕێوەبەردنی کاروباری گشتی". بەڵام (ئۆستن رنی) پێناسەی پارتی سیاسی دەکات بەوەی کە "کۆمەڵێك ڕێکخراوی سەربەخۆن، نوێنەرەکانیان دیاری دەکەن و بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا دەکەن بەهیوای بەدەستهێنانی پۆستی حکومی و هەژمون و دەسەڵاتداری بەسەر بەرنامەکانی حکومەتدا". (ڕۆبرت ماکیڤەر)یش دەڵێ "پارتی سیاسی ئامرازی دیموکراسییەتی نوێیە". بەڵام (هارولد لاسوێل) پارت بەوە دەناسێنێت کە "کۆمەڵێك تاکی کۆمەڵ کۆدەبنەوە و کێشە گشتییەکان دەخەنە بەردەم لایەنی پەیوەندیدار و پاڵێوراوی خۆیان بۆ هەڵبژاردنەکان دیاری دەکەن". لەلایەکیترەوە (جیۆڤانی سارتۆری) دەڵێ "پارتی سیاسی کۆمەڵێك خەڵکن دەچنە ململانێکانی هەڵبژاردنەوە و پاڵێوراو بۆ ئاستە جیاوازەکان دیاری دەکەن". بەڵام بە ڕای (سیگمۆند نیومان) "پارتی سیاسی ڕێکخستنی ئەو کەسانەیە کە دەیانەوێت لە پرۆسەی سیاسیدا بەشداربن و تێڕوانینی جیاوازیان هەیە و بەردەوام لە ململانێدان لەگەڵ لایەنەکانی دیکە بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی گەل". (ستالین)یش پێیوایە "پارتی سیاسی پێکهاتەی چینێکە. واتە پێکهاتەی نوێنەر و بالا و پێشڕەو". (فرانسوا ژوا) بیرمەندی فەرەنسی دەڵێ "پارتی سیاسی بریتیەلە کۆبونەوەی کۆمەڵێك خەڵك لەپێناو بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسی و هەوڵدەدەن بۆ گەیشتن بەدەسەڵات یان وەرگرتنی هەموو دەسەڵات هەتا لەڕێیەوە ئایدیۆلۆژیا و بەرژەوەندی ئەندامەکانی

بەدیبهێنێت". لە قاموسی بەریتانیشدا پارتی سیاسی بریتیەلە "پاراستنی ڕێکخراوێکی یەکگرتوو لەپێناو بەدیهێنانی چەند ئامانجێکدا کە هەڵبژاردووە و هەوڵی بەدیهێنانیشی دەدات". بەڵام بیرمەندی بەناوبانگی بواری پارتە سیاسییەکان (مۆریس دۆڤرجیێ) وا پێناسەی پارت دەکات کە بریتیەلە "کۆبونەوەی ئەو تاکانەی کە پێکەوە کاردەکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دیاریکراو".

لەنێوان هەموو ئەم پێناسانەدا دەکرێت چەند خاڵێکی هاوبەش بدۆزینەوە کە بریتین لە:

١. پێویستی بوونی تێڕوانینێکی سیاسی یەکگرتوو، واتە بوونی ئایدیۆلۆژیای هاوبەش کە لە بەرنامەی پارتە سیاسییەکەدا ڕەنگ بداتەوە کاتێك ئەو بەرنامەیە هەڵبژاردنەکاندا. پێشکەشی هاووڵاتیان دەکرێت لە پرۆسەی

٢. بوونی ڕێکخستنێك کە گشتگیری و بەردەوامییەکی پێوەدیاربێت و شۆڕببێتەوە بۆ هەموو ئاستەکانی ناوخۆیی و ناوچەیی و نەتەوەییەکان.

٣. گرنگیدانی پارتی سیاسی بە پشتگیری گەل و ڕاکێشانی پاڵپشت و دۆستان بەتایبەتی لە کاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و دەنگدان و خۆپیشاندانە گشتییەکان.

٤. هەوڵدانی بەردەوام بۆ گەیشتن بە دەسەڵات یان بەشداریکردن تیایدا لەڕێی دروستکردنی هاوپەیمانێتییەکان وەك هەوڵێك بۆ دروستکردنی کاریگەری لەسەر بڕیارەکان و ئەولەویاتەکانی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لەوکاتەی پارتی سیاسی دەبێتە ئۆپۆزسیۆن.

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بەم شێوەیە پێناسەی پارتی سیاسی بکەین {کۆبونەوەی کۆمەڵێك خەڵکە بەشێوازێکی ڕێکخراو، کەهەمان بەرژەوەندی و پرەنسیپی دیاریکراویان هەیە بە سەرکردایەتییەکی یەکگرتووەوە لەپێناو گەیشتن بەدەسەڵات یاخود بەشداربوون تیایدا هەوڵ دەدەن و بۆچونیان لەیەکەوە نزیکە}.

- **ڕەگەزەکانی پارتی سیاسی:**

بۆ ئەوەی بە دامەزراوەیەکی دیاریکراو بوترێت پارتی سیاسی، پێویستە چەند ڕەگەزێکی سەرەکی تێدابێت، لێرەشدا بیرمەندان چەند بۆچونێکی جیاوازیان هەیە. بۆ نموونە (ئەنتۆنیۆ گرامشی) پێی وایە کە پارتی سیاسی دوو ڕەگەزی سەرەکی هەیە.

١. بڵاوبونەوەی فراوان بێت و هەموو ئاستەکانی خەڵك بگرێتەوە.

٢. یەکانگیری و پەیوەستبوون (واتە پێویستە شتەکان لە هەموو لایەك وەك یەك بێت، بۆ نمونە پێویستە لە ئۆرگانەکانی هەمان پارتی سیاسیدا سیاسەتی مامەڵەکردن و بۆچونی پارت سەبارەت بە لایەنگر، ئەندام و پاڵێوراو لە هەموو شوێنەکانی ئەو وڵاتە وەك یەك داڕێژرابێت).

لەلایەکیترەوە لێکۆڵیار (جۆزیف بالومبارا) پێی وایە لە پارتی سیاسیدا چوار ڕەگەز پێویستە، ئەوانیش:

١. ڕێکخراوێکی هەمیشەیی بێت (تەنانەت دوای نەمانی سەرکردەکانیان).

٢. ڕێکخراوێکی تەواو پتەوبێت (لە سەرکردە تاخوارەوە لەناو وڵاتدا بوونیان هەبێت).

٣. هەوڵ بدات بەشداری لە دەسەڵاتدا بکات.

٤. خاوەنی هێزێکی جەماوەری فراوان بێت.

لێرەوە دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی گشتی پێنج ڕەگەزی سەرەکی لەپارتی سیاسیدا هەیە:

**یەکەم: جەماوەر:**

پێویستە لەهەموو پارتێکی سیاسی‌دا بنکەی جەماوەری هەبێت، کە بریتیە لە کۆمەڵێك خەڵك بەشێوەیەکی خۆبەخشانە و پاش باوەڕهێنان بە پرەنسیپ و بەرنامەی ئەو پارتە بوونەتە جەماوەری و بانگەشەی بۆ دەکەن و بەرگری لێ دەکەن. هەر پارتێك بنکەی جەماوەری فراوان بێت، هێز و کاریگەری زیاتر دەبێت، بەمەش توانای گەیشتنی بە دەسەلاٌت بەهێزتر دەبێت.

**ئاستەکانی پەیوەست بوونی جەماوەر بە پارتی سیاسیەوە:**

مەبەست لە ئاستەکانی پەیوەستبوونی جەماوەر بە پارتە سیاسیەکانەوە گرنگترین ئەو شێوازانەیە، کە جەماوەر بە پارتی سیاسییەوە دەبەستێتەوە، کە ئەوانیش بریتین لە:

١. دەنگدەر:

لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا کودەتا و شۆڕش دوو ڕێگەی سەرەکی گەیشتن بە دەسەڵات، بەڵام هەڵبژاردن ڕێگەی سەرەکی و سروشتی و شەرعی پارتە سیاسییەکانە لە ئەمریکا و ئەوروپادا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، لەبەرئەوە لەو وڵاتانەدا دەنگدەر ڕۆڵێکی سەرەکی و بنەڕەتی هەیە لە ژیانی پارتە سیاسییەکاندا.

دەنگدەر ئەو کەسەیە، کە بەشێوەیەکی نهێنی دەنگ بۆ پارتێکی سیاسی دیاریکراو دەدات بەبێ ئەوەی ئاشکرای بکات، بەڵام ئەگەر ئاشکرای کرد، کە دەنگی بۆ پارتێکی سیاسی دیاریکراو داوە، ئەوا دەبێتە لایەنگر یان پاڵپشت یان دۆست.

٢. لایەنگر:

لایەنگر ئەو کەسەیە، کە بەشێوەیەکی زیاتر لە دەنگدەر پاڵپشتی پارتێکی سیاسی دیاریکراو دەکات و ئاستی لە ئەندام کەمترە و بڕوای بە بەشێك لە پرەنسیپەکانی پارت هەیە و بەرگری لێدەکات و بانگەشەی بۆ دەکات و دەگونجێت بەشداربێت لە کۆکردنەوەی دارایی بۆ ئەو پارتە. هەندێکجار لایەنگر زیاتر پاڵپشتی پارتێکی سیاسی دەکات لەچاو هەندێك لە ئەندامانی ئەو پارتەدا، بەڵام تەنها وەك لایەنگر دەمێنێتەوە، چونکە بە داوایەکی نووسراو داوای بەئەندامبوونی پێشکەش بە پارتەکە نەکردووە.

چەند هۆکارێك هەیە وادەکات لایەنگر نەبێتە ئەندامی پارتی سیاسی، لە گرنگترینیان:

أ. هۆکاری دەرەکی:

زۆرێـك لـە لایـەنگران نایانـەوێت ببنـە ئەنـدامی پـارتێکی سیاسـی دیاریکراو لە ترسی ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەسـەلات دەیگرێتەبەر، وەك بەدواداچوونیان و پـشکنینی ئـەو شـوێنانەی کـاری تێـدا دەکـەن یـان تیایـدا دەژیـن. یـان هەنـدێجار لایـەنگری پـارتێکی سیاسـی پۆسـتێکی بەرزی لە دەوڵەتدا هەیە و نایەوێت بەهۆی ئەو ئەندامێتییەوە لەدەستی بدات. یـان دەگونجێـت ئـەو کەسـەی کـە لایـەنگری پـارتێکی سیاسییە، پەیوەندییـەکی بـەهێز و دۆسـتانەی هـەبێت لەگـەڵ دەسـەلاتدا و بـەو ئەندامبوونـەی لـە پـارتێکی سیاسـی دیـاریکراودا ئـەو پەیوەندییـە لەدەسـت دەدات. بـەلام بەمانـەوەی وەك لایـەنگر هـیچ جـۆرە حیزبیبوونێکی بەسەردا ناسەپێت. ئەم هۆکارە دەرەکییانەش زیاتر لـە وڵاتە دواکەوتووەکاندا کاریگەری هەیە.

ب. هۆکاری خودی:

ئەم هۆکارە پەیوەندی بە هەستی لایەنگرەوە هەیە، کە پێی وایە لە کـاتی بـوونی بـە ئەنـدامی پـارتێکی سیاسـی دیـاریکراو، کەسـێتی و سەربەخۆیی خـۆی لەدەسـت دەدات و تاڕاددەیـەکی زۆر ئازادییـەکانی بەرتەسـك دەبنـەوە. ئـەم حاڵەتـە لـەناو چـینی ڕۆشـنبیراندا کاریگـەری هەیە، کە ئەوان بڕوایان بە بەشێك لە پرەنسیپەکانی پارتێکی سیاسی هەیە نەك هەمووی، یان هەندێجار ئەو کەسە لە بنەماڵەیەکی ناسراوە و ئەو بنەماڵەیە ڕێگەی نادەن ببێتە ئەندامی پارتێکی سیاسی جیاواز لەو پارتە سیاسییەی بنەماڵەکە بڕوای پێی هەیە.

٣ ئەندام:

ئەو كەسانەن كە لەرێی پێشكەشكردنی داوایەكی فەرمییەوە بونەتە ئەندامی پارتێكی سیاسی، ئەمەش پاش بڕواهێنان بە پرەنسیپ و بنەما گشتییەكانی ئەو پارتە و پڕكردنەوەی فۆرمی ئەندامێتی و بەڵێندان بە پێدانی ئابوونە.

لە هەموو پارتێكی سیاسیدا دوو جۆر ئەندام هەیە:

أ. ئەندامی ئاسایی:

ئەو ئەندامانەن كە خۆیان ئەركی بانگەشە و بڵاوكردنەوەی پرەنسیپ و بنەماكانی پارتەكەیان لەسەرشانی خۆیان لابردووە و تەنها ئەندامێكی ئاسایی پارتن و نایانەوێت نوێنەری ئەو پارتەبن لەو ژینگەیەی تیایدا دەژین و ئامادەییان لە كۆبونەوەكاندا كەمە، بەڵام ئاشكران كە ئەندامی ئەوپارتەن.

ئەندامی کارا:

بناغـەی سـەرەکی پـارتی سیاسـین و بەرپرسـیارێتی و ئـەرکی بڵاوکردنـەوەی بنـەماکانی پارتیـان لەئەسـتۆ گرتـووە و بـەردەوام لـە کۆبونەوەکاندا ئامادەییان هەیە. ئەم ئەندامانە جێبەجێکاری ئەو بڕیار و ڕاسـپاردانەن، کـە لـە سـەرووی خۆیانـەوە دەردەچـێت و کاریـان بەڕێوەبردنی ئۆرگانەکانی ئەو پارتەیە.

لـەم خـشتەیەی خـوارەوەدا هەوڵـدەدەین گـرنگترین جیـاوازی نێـوان لایەنگر و ئەندام بخەینەروو بەمشێوەیە:

| | لایەنگر | ئەندام |
|---|---|---|
| ١. | بـڕوای بـە بەشـێك لـە پرەنـسیپ و بنـەماکانی پارت هەیە. | ١. بـڕوای بـە هـەموو پرەنسیپەکانی پارت هەیە. |
| ٢. | پەیوەنـدی بـە پارتـەوە پەیوەندییەکی دۆستانەیە. | ٢. پەیوەنـدی بـە پارتـەوە پەیوەندییـەکی فـەرمی و ڕەسمیـە، چـونکە فـۆرمێکی ئەندامێتی پڕکردۆتەوە. |
| ٣. | سەربەستە لە ئەنجامدان یـاخود ئەنجامنـەدانی کارێـك کـە پەیوەنـدی بـە پارتەوە هەبێت. | ٣. پێویستە کارەکانی پارت جێبەجێ بکات و بەپێچەوانەوە توشی لێپرسینەوە دەبێتەوە. |

دووەم: پرەنسیپ و بنەما:

پرەنسیپ گرنگی زۆری هەیە لە ژیانی پارتی سیاسیدا و کاریگەری لەسەر لایەنگری و بەئەندامبوونی خەڵك هەیە لەو پارتە سیاسیەدا، هەر کاتێك پرەنسیپەکان بەهێزبوون و کاریگەربوون، ئەوا زیاتر سەرنجی جەماوەر ڕادەکێشن و وادەکات بڕوای پێ بهێنن و بانگەشەی بۆ بکەن. بەهەمان شێوە بەرژەوەندییەکانیان کاریگەریان هەیە لە شێوازی لایەنگری و بەئەندامبوون و پاڵپشتی، هەرکاتێك جەماوەر هەستی کرد بەرژەوەندییە گشتییەکانی لە پرەنسیپەکانی پارتێکی سیاسی دیاریکراودا دەبینێتەوە، ئەوا ئەوکات ڕێژەی لایەنگری خەڵك بۆ ئەو پارتە زیاد دەکات و توانای گەیشتنی بە دەسەڵات زیاد دەبێت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لە پشت پرەنسیپەوە بەرژەوەندی هەیە و هەمیشە ڕێژەی زاڵبوونی بەرژەوەندی بەسەر پارتەکان دا زیاترە لە ڕێژەی کاریگەری پرەنسیپەکان. ئەمەش مانای ئەوە نیە، کە پارتی سیاسی ئەبێت پرەنسیپی بەلاوە گرنگتربێت لە بەرژەوەندی، بەڵکو دەبێ لە داڕشتنی پرەنسیپەکاندا ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی خەڵك بکات.

سێیەم: ڕێکخستن:

بیرمەندی ئەڵمانی (ڕۆبێرتۆ میشال) لە کتێبی (سۆسیۆلۆژیای پارتە سیاسییەکان)دا دەڵێت ناکرێت دیموکراسیەت هەبێت بەبێ بوونی ڕێکخستن، پارتە سیاسییەکان دەزگایەکی ململانێن بەمەبەستی گەیشتن بە دەسەڵات، کە ئەمەش لە پرۆسەیەکی ڕێکخراودا جێبەجێ

دەبێت، لەبەرئەوە ڕێکخستن ڕۆڵی سەرەکی و بنەڕەتی دەبینێت لە یەکلاییکردنەوەی ئەو ململانێیەدا.

ڕێکخستن هێزێکە لە هۆشیاری زانستی و پراکتیکی، وا دەکات بڕیار و هەڵوێستەکانی پارتی سیاسی ڕەنگدانەوەی واقعی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کلتوری کۆمەڵگە بێت. پارتی سیاسی ئەرکێکی دیاریکراوی لەئەستۆدایەو ناتوانێت ئەو ئەرکانە بەجێ بهێنێت بەبێ بوونی ڕێکخستنی پتەو و ڕاستەقینە.

ڕەگەزی ڕێکخستن ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگی هەیە لە ژیانی پارتی سیاسیدا. بە زانینی ڕادەی هێز و پتەوی ڕێکخستن دەتوانرێت ڕێژەی سەرکەوتنی پارتی سیاسی دیاری بکرێت. لەراستیشدا یەکەی بنەڕەتی ڕێکخستنی حزبەکان لە حزبێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێت بەپێی ئەو شێوە پێکهاتەیەی ئەو پارتە سیاسییەی لەسەر بنیاتنراوە. مەبەست لەپێکهاتەی ناوخۆیی پارتی سیاسیش ئەو یەکە سەرەکییانەن، کە پارتە سیاسیەکانی لێ پێکهاتوە. بەڵام لەبەرئەوەی نەریت و سیستەمێکی دیاریکراو نییە بۆ دابەشبوونی پارتە سیاسیەکان بەسەر ئۆرگان و یەکەکاندا. هەربۆیە چەند نمونەیەك لەو یەکە و ئۆرگانانە وەردەگرین، کە لە پارتە سیاسییەکاندا هەبووە.

**نه دیارترین نمونەی هەندێك لە یەکە بنەڕەتییەکانی ڕێکخستنی پارتی سیاسی:**

١. **لیژنە:**

وەك یەکەیەکی بنەڕەتی پارتە سیاسییەکان لە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکاندا پەیڕەو دەکرێت، بەشێوەیەك لە زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پارتە سیاسییەکان لیژنەیەك بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان لە سنووری شارەکاندا پێك دەهێنن. لیژنە داهێنراوی پارتە موحافزکارەکانە، بەتایبەتی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا.

**لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی لیژنە:**

١. ژمارەیەکی کەم ئەندامی هەیە

٢. ئەندامیی تیایدا کراوە نییە. بەڵکو لەڕێی پاڵاوتن. یان لەڕێی دامەزراندنەوە ئەندامی بۆ دیاری دەکرێت.

٣. ئەندامەکانی کەسایەتی دیار و سەرمایەدارن.

٤. بەهێزی ئەندامەکانی مانای بەهێزی لیژنەیە.

٥. دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە.

٦. سنووری جوگرافیای کارکردنی فراوانە.

٧. چالاکییەکانی بەشێوەیەکی دەوری و بەردەوام نییە، لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا ئەکتیڤە و لە کاتەکانیتردا زۆر چالاك نیە.

**لیژنە چەند جۆرێکی هەیە :**

- **لیژنەی ڕاستەوخۆ:**

کۆمەڵێك کەسایەتی دیار لەخۆدەگرێت، کە بەهۆی لێهاتوویی کەسێتی و تواناکانیان دیاریکراون بۆ ئەوەی لەو لیژنەیەدا هەبن، وەك "خاوەن موڵکەکان. پزیشك. پارێزەر،....هتد" لە شار و شارۆچکەکان، ئەمانە نوێنەرایەتی کۆمەڵگە ناکەن، بەڵکو تەنها نوێنەری کەسێتی خۆیانن، لە دیارترین نمونەش لیژنەکانی پارتی ڕادیکاڵی فەرەنسی.

- **لیژنەی ناراستەوخۆ:**

لە نوێنەرانی ڕەگەزە لۆکاڵییەکان پێکدێت. کە هەر نوێنەرێك-تایبەتمەندی دەرکەوتن-ی هەیە بەهۆی ئەو دەسەڵاتە فراوانەی کە هەیەتی، دیارترین نمونەی ئەم لیژنانە لیژنەکانی پارتی کرێکارانی بەریتانیا.

- **لیژنەی هونەری:**

لە کۆمەڵێك کەسایەتی پێکدێت کە بەهۆی ئەزموون و لێهاتوویی و لێزانییان لە بەڕێوەبردنی پرۆسەکانی هەڵبژاردندا بۆ ئەو پارتە سیاسییە دیاری کراون. دیارترین نمونەش لیژنەی پارتە سیاسییەکانی ئەمریکایە.

۲. **پۆل (بەش):**

نزمترین ئاستی حزبییە لەو پارتە سیاسییانەی (پۆل) وەك یەکێك لە یەکەکانی ڕێکخستنیان بەکاردەهێنن. یەکەمین دەروازەیە کە خەڵك لێوەی دەچنە ناو پارتی سیاسییەوە. لەراستیدا (پۆل) زیاتر لەو پارتە

سیاسییانەدا هەیە، کە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا هەن. (پۆل) داهێنراوی پارتە سۆشیالیستییەکانە.

**لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پۆل:**

١. ژمارەی ئەندامەکانی زۆرترە لەچاو لیژنەدا.

٢. ئەندامەکانی لەسەر بناغەیەکی دیاریکراو هەڵنەبژێرراون و زیاتر کەسانی ئاسایی نێو کۆمەڵگەن.

٣. ئەندامێتی تیایدا کراوەیە بۆ هەر کەسێك بیەوێت ببێتە ئەندام، ئەمەش پاش پەسەندکردنی پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆی ئەو پارتە.

٤. سنوری جوگرافی کارکردنی کەمترە لەچاو لیژنەدا.

٥. پەیوەندییەکی مەرکەزییانەی هەیە بەسەروو خۆیەوە.

٦. چالاکییەکانی بەردەوامە و پەیوەست نییە بە تەنها کاتێکی دیاریکراوەوە.

٧. تەعبیر لە جەماوەر دەکات. بەو مانایەی یەکەیەکی نزیکی ئەو پارتەیە لە خەڵکەوە.

٣. **شانە:**

**داهێنراوی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتییە. کە لە سێیەمین کۆنگرەی جیهانی هەموو پارتە کۆمۆنیستەکانی جیهاندا، کە لە ٢١ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤دا لە شاری مۆسکۆ بەڕێوەچوو، پەسەند کرا.**

**لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی شانە:**

١. ڕێکخستنەکانی پتەو و تۆکمە و نهێنین.

٢. کارەکانی ڕێکخراو و نهێنین.

٣. ژمارەی ئەندامەکانی کەمە.

٤. فاکتەری پیشەیی هۆکاری سەرەکی دروستبوونیەتی.

٥. کۆمەڵێك ئەندامی پارتیکی سیاسی لەخۆدەگرێت، کە لە شوێنێکی دیاریکراودا کاردەکەن.

**جۆرەکانی شانە:**

أ. ئەو شانانەی کە ئەندامانی هەمان پیشەیان هەیە، بەڵام زیاتر سەرقاڵ دەبن بە کێشە پیشەییەکان، لەوانە چاکبوونی گوزەران، بەرزکردنەوەی نرخی کار، بەمەش تاڕادەیەك لە کاری سیاسی دووردەکەونەوە.

ب. ئەو شانانەی کە ئەندامانی پیشەی جیاوازیان هەیە، خاسیەتی سەرەکییان بریتیەلە هەمەچەشنی کاریان، بەمەش زیاتر بە پرۆسەی سیاسیەوە سەرقاڵ دەبن. لە دیارترین نمونە، شانەکانی پارتی کۆمۆنیستی لە فەرەنسا، سۆڤیەت و ئیتاڵیا.

لەراستیدا ژمارەی ئەندامانی (شانە) لە پارتێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێت، بۆ نمونە لە پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی ژمارەی ئەندامانی شانە ٣ کەسە، بەڵام لە پارتی کۆمۆنیستی ئیتاڵی ئەندامانی ژمارەی ئەندامانی شانە ٧ کەسە. بەڵام بیرمەند (مۆریس دۆڤرجی) پێیوایە ژمارەی گونجاوی ئەندامانی شانە (١٥ بۆ ٢٠ کەسە)، بەهەمان شێوە لە پارتە ئیسلامیەکانیشدا نمونەی شانە هەیە.

٤. **میلیشیا:**

**داهێنراوی پارتی فاشی ئیتاڵیایە، بەڵام پێشتریش هەبووە وبە شێوازی تر و ڕۆڵیشی لاوەکی بووە. شێوازێکە لە شێوازەکانی هێزی سەربازی، بەڵام سروشتێکی مەدەنیانەی هەیە، ئەندامەکانی گوێڕایەڵی هەمان سیستەم دەبن، کە هێزێکی سەربازی پەیڕەوی دەکات و جلوبەرگ و شێوازی کاریان شێوازێکی سەربازییانەیە. ئەمانە هێزێکی سەربازی دەرەوەی هێزە سەربازییە ڕێکخراوەکانی دەوڵەتن.**

**لەنێو میلیشیادا دوو جۆرە ئەندام هەیە، کە بریتین لە:**

أ. ئەندامی کارا: ئەوانەن کە کاری گرنگ و مەترسیدار ئەنجام دەدەن، وەك پاراستنی کۆبونەوەکانی پارت. لێدانی نەیاران. کارکردن **بۆ بڵاوکردنەوەی نووسراوە حزبیەکان و پروپاگەندە بۆ پارتەکە.**

**ب. ئەندامی یەدەگ: ئەو کەسانەن کە تەمەنیان گەیشتۆتە ٣٥ساڵ و سەرووتر و چەند پۆستێکی دیاریکراو بەڕێوەدەبەن و گرنگی کاریان کەمترە لەو کارانەی کە ئەندامی کارا بەڕێوەی دەبەن.**

**چوارەم: سەرکردایەتی:**

**بۆ هەر کۆمەڵێك لە خەڵك ڕێکخستنێکی بەهێز پێویستە، بۆ هەر ڕێکخستنێکیش سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو بەهێز پێویستە، کە بتوانێت بەرپرسیارێتی کار و هەڵسوکەوت و بڕیاردان لەو پارتە سیاسیەدا لەئەستۆ بگرێت، جا ئەو بڕیارانە بەئاراستەی ئەنجامدانی کارێك بێت لەلایەن ئەو پارتەوە، یان بەئاراستەی دوورکەوتنەوەی حزب لە کار و هەڵوێستێکی تایبەت بە بابەتێکی دیاریکراو.**

هـــەموو پـــارتێکی سیاســـی پێویـــستی بـــە هۆشـــیارکردنەوە و بەڕێوەبردنی جەماوەر و لایەنگر و ئەندامان هەیە، چونکە هەمیشە لـە ململانــێ و کێبرکێدایــە بــۆ گەیــشتن بــە دەســەڵات، بــەڕێوەبردنی ئــەم ململانێیــەش پێویــستی بــە ســەرکردایەتیەکی هۆشــیار و بــەتوانا و لێهاتوو هەیە.

ســەرکردایەتی دەســتەیەکی هەڵبــژێردراوی پــارتێکی سیاســیە و فــەرمانڕەوا و بڕیاردانــەری ئــەو پارتــەن و نوێنەرایــەتی دەکــەن لەســەر ئاستە بالاکـان. لێهاتوویـیـەکی بـاش و توانایـەکی فراوانیـان هەیـە لـە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو پارتـە سیاسـیەدا و ئـەزموون و مێژوویـەکی دیاریکراویان لەناو ئەو پارتەدا هەیە.

**شێوازەکانی دیاریکردنی دەستەی سەرکردایەتی:**

دوو شێوازی سەرەکی هەیە بۆ دیاریکردنی دەستەی سـەرکردایەتی پارتە سیاسییەکان، کە بریتین لە:

١. **شێوازی دیموکراسی ( هەڵبژاردن ):**

ئـەو شـێوازەیە کـە تیایـدا سـەرکردایەتی پـارتێکی سیاسـی لـەڕێی کـۆنگرەی دروسـتبوون، یـان ئـەو کۆنگرانـەی کـە دواتـر دەبەسـترێن، هەڵدەبـژێردرێن، تیایـدا هــەموو ئەنـدامانی کـۆنگرە سەربەسـتن لــە هەڵبـژاردنی هـەر کەسـێك کـە دەیانـەوێت ببێتـە سـەرکردە و دەسـتەی سـەرکردایەتی ئـەو پارتـە، ئـەم شـێوازە زیـاتر لـە پارتـە سیاسـیەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا بەدی دەکرێت.

**٢. شێوازی ئۆتۆکراتی (تاکڕەوی):**

پارتە فاشیستەکان لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا لە سەردەمی مۆسۆلۆنی و هیتلەردا، ڕاشکاوانە ڕایاندەگەیاند کە شێوازی ئۆتۆکراتی پەیڕەو دەکەن لە دیاریکردنی سەرکردایەتی پارتەکانیان. ئەم حاڵەتەش زیاتر لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا باوە، کە سەرکردەکان خۆیان دادەمەزرێنن بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو.

**ئەم شێوازە دوو تیۆری سەرەکی هەیە:**

**أ. تیۆری ئەڵمانی (جێرمانی):**

سەرکردە لەم بیردۆزەدا سێبەری خواوەندە لەسەر زەوی و خواوەند پاڵپشت و هاوکاریەتی لەهەر هەنگاو و کارێکدا. ئەو نوێنەری گەلە و هەڵسوکەوت و کارەکانی گەل لەودا ڕەنگ دەداتەوە. لەبەرئەوە دەسەڵات و سەروەرییەکی ڕەهای هەیە بە ناوی گەلەوە و لەسەر گەلە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت و جێبەجێیان بکات. بەپێی ئەم بیردۆزە سەرکردە کەسێکە لەسەروو ئاستی ئاسایی مرۆڤەوەیە، ئەم بیردۆزە زیادەڕەوییەکی (مبالغە) لە ڕادەبەدەری تێدایە. لەبەرئەوە لەئێستادا جێی بڕوا و متمانە نین.

**ت. تیۆری لاتینی:**

سەرکردە لەم بیردۆزەدا پیاوی قەدەر و چارەنووسە، بارودۆخ لە هەرەمی دەسەڵاتدا دایناوە، بۆ ئەوەی سەرکردایەتی گەل بکات بەرەو سەرکەوتن بە ژیری و تواناکانی خۆی. ئەم بیردۆزە سەرکردە

ناگەیەنێتە حاڵەتی پیرۆزی و پەرستن وەك لای بیردۆزی ئەڵمانییەکان.
بۆ سەرکردایەتی و چارەنووسی نەتەوە پێویستە.

هەردوو بیردۆزی ئەڵمانی و لاتینی ئاستێکی بەرز دەدەنە سەرکردە و مافی دامەزراندنی یاریدەدەرەکانی لە دەستەی سەرکردایەتیدا دەداتە سەرکردە.

هەندێك پارتی سیاسی هەردوو شێوازی دیموکراسی و ئۆتۆکراتی پەیڕەو دەکەن لە دیاریکردنی سەرکردایەتی پارتە سیاسیەکانیاندا، وەك (پارتی کۆبونەوەی گەلی فەرەنسا) کە لە ساڵی ١٩٤٧ لەلایەن ژەنەراڵ دیگۆلەوە دروست کرا. لەم پارتەدا نووسینگەی هەڵبژێردراوی شارەکان هەیە، گەبەشێوازێکی دیموکراسییانە هەڵدەبژێردرێت، بەلاّم لەسەر ئاستی هەرێمەکاندا کەسێك دادەمەزرێنرێت لەلایەن ناوەندی گشتیەوە کە جێبەجێکردنی سەرجەم کارەکان بە بڕیاری ئەو دەبێت و دەسەلاّتێکی فراوانی هەیە و بڕیار و ڕێوشوێن لەلایەن ئەو نوسینگە هەرێمایەتیەوە دیاری دەکرێت، کە ئەو کەسە دامەزرێنراوە سەرۆکایەتی دەکات، بەلاّم ئەو کەسە خاوەنی مافی ڤیتۆیە. کەواتە بۆمان دەردەکەوێت سەرکردەی نووسینگەی هەرێمایەتی خاوەنی دەسەلاّتی گشتی و ڕاستەقینەیە، هەربۆیە لە نوسینگەی هەرێمایەتیدا هیچ بڕیارێك ناخرێتە بواری گفتوگۆ و بڕیار لێدانەوە بەبێ ڕەزامەندی پێشوەختی سەرۆکی نووسینگەی هەرێمایەتی، هەروەها بە هەمان شێوە ئەم حاڵەتە لە (پارتی بزوتنەوەی گەلی کۆماری فەرەنسا) و پارتی مەسیحی سۆشیالیستی بەلجیکی و پارتی سۆشیالیستی نەمسا)دا بەدیدەکرێت.

- **گرنگی دەستەی سەرکردایەتی:**

لەو توێژینەوانەی کە (ڕۆبرتۆ میشاڵ) لە کتێبی (سۆسیۆلۆژیای پارتەسیاسیەکان)دا ئەنجامیداون، لێکۆڵینەوەیەکی فراوان لەسەر سەرکردایەتی پارتە سۆشیالیستەکان کراوە، بەتایبەتی (پارتی دیموکراتی سۆشیالستی ئەڵمانیا )، (ڕۆبرت) گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەندامانی پارتێکی سیاسی گوێڕایەڵ و ملکەچی دەسەڵاتی کەمینەیەکن لەو پارتەدا، کە بە دەستەی سەرکردایەتی ناسراوە، ئەو پێی وایە کاتێک دەڵێین هێز واتە (کۆنترۆڵ کردن)، هەموو کۆنترۆڵکردنێکیش لایەنێك ملکەچ دەکات. پارتی سیاسی دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئەندامانیدا هەیە و هەتا قەبارەی پارتەکە گەورەتربێت و ژمارەی ئەندامانی زۆرتربێت، ئەوا پێویستی بە بەهێزی دەسەڵاتی دەستەی سەرکردایەتی ئەو پارتە زیاد دەکات

لەلایەکی ترەوە (برتراند راسڵ) کە یەکێکە لە بیریارە گەورەکانی بواری زانستی سیاسی و خاوەنی کتێبی دەسەڵاتە. پێیوایە کە ناتوانین ملکەچی بۆ دەسەڵاتی سەرکردایەتی بە ژمارەی ئەندامان یان بەرهەمی ئابوری یان توانای تەکنەلۆژی بپێوین. بەڵکو زۆرجار ئایدیۆلۆژیا و بیروباوەر وادەکات، کە ئەندامانی پارتێکی سیاسی ئەو پابەندبوونە ئەخلاقیەیان هەبێت. بڕوابوون بە بیروباوەرێکی تایبەتی دیاریکراو، هەندێکجار مرۆڤ دەباتە دەرەوە. کە بتوانێت بیربکاتەوە، بۆیە زۆرجار گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ دەستەی سەرکردایەتی ئەنجامی کۆتایی ئەو کەسانەیە، کە لەسەر بناغەیەکی ئایدیۆلۆژی کۆبونەتەوە. بێگومان ئەم حاڵەتە مەترسییەکی ئەوتۆ دروست دەکات بەئاراستەی سەپاندنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و سەرکردەکان لەناو کۆمەڵێکی

دیاریکراودا. بەهەمان شێوە ئەم قسەیە بۆ پارتێکی سیاسیش ڕاستە. کە لەسەر بناغەی ئایدیۆلۆژی کۆبوبنەوە، بێگومان ئەمەش لە مێژوودا دەیان نمونەی هەیە.

دەبێت ئەو ڕاستیەش بزانین کە ئەگەر کۆبونەوەی کۆمەڵێك کەس لە شێوەی پارتێکی سیاسیدا لەسەر بناغەیەکی فکری و ئایدیۆلۆژی بێت، بەڵام تیایدا ئاڵوگۆڕی دەسەڵات و پرنسیپە سەرەکیەکانی دیموکراسی پەیرەوبکرێت. ئەوا کاریگەرییەکی نێگەتیڤانەی نابێت، چونکە بەبوونی ئەم حاڵەتە دەرگای ڕەخنەگرتن لە سەرکردایەتی ئەو پارتە والاّ دەبێت بەمەش ڕادەی ملکەچی ئەندامان کەم دەبێتەوە.

چەند هۆکارێك هەیە کە وادەکات خاوەن دەسەڵاتەکان و سەرکردە و دەستەی سەرکردایەتی هۆگری دەسەڵات بن و ئامادە نەبن بە هیچ جۆرێك کورسی دەسەڵات بەجێبهێڵن، لە گرنگترین ئەو هۆکارانەش:

١. **خواست:**

لە سروشتی مرۆڤدا خواست سیفەتێکی سەرەکیە، کاتێك مرۆڤێك خواستی ئەوەی هەیە بگات بە ئامانجێك ئەوا کارێکی شیاو و ئاساییە، بەڵام ئەگەر بیەوێت ئەو ئامانجەی لەسەر حسابی مافی خەڵکانێکی تر بەدەست بهێنێت، ئەوا خواست دەگۆڕێت بۆ چاوتێبڕین. بە هەمان شێوە بوونی خواست بۆ گەیشتن بە دەسەڵات بەشێوەیەکی شەرعیانە کارێکی گونجاوە، هەر ئەمەش وادەکات سەرکردە و دەسەڵاتدارەکان لەدوای گەیشتنیان بە دەسەڵات هەوڵی مانەوە و پاراستنی ئەو دەسەڵاتەیان بدەن.

٢. ئارەزوو لەدەسەڵات (الرغبة):

مرۆڤ بەپێی سروشتی خۆی ئارەزووی گەیشتن بە دەسەڵات و پارێزگاریکردن لێی و هەوڵدان بۆ فراوانکردنی دەکات. سەرکردەکانیش بەهەمان شێوە وەك مرۆڤێك سروشتی گەیشتن بە دەسەڵات و پاراستنی دەسەڵاتەکانیان دەکەن. بەڵام پێویستە لێرەدا جیاوازی بکەین لەنێوان دوو جۆر سەرکردەدا:

أ. ئەو سەرکردانەی لەنێو ڕیزەکانی گەلەوە دەگەنە دەسەڵات، کە چەند سیفەتێکی سەرەکییان هەیە وەك:

- ترسیان لە نەمانی دەسەڵاتەکەیان کەمە.
- بڕوایان بە گۆڕانکاری هەیە.
- لەبەرئەوەی لەنێو ڕیزەکانی گەلەوە هاتوون. بۆیە خۆیان بە نوێنەری ئیرادەی گەل دەزانن.

ب. ئەو سەرکردانەی لەناو چینە باڵاکانی کۆمەڵگەوە دەگەنە دەسەڵات، کە چەند سیفەتێکی سەرەکییان هەیە وەك:

*پێی وایە دەسەڵاتەکەی درێژکراوەی ئەو دەسەڵاتەیە. کە لەناو چینە باڵاکەی خۆیدا هەیەتی.

*بڕوای بە گۆڕانکاری کەمە و هەندێجاریش لە دژی هەر گۆڕانکارییەك دەوەستێت، کە لە دەسەڵات و خواستەکانی کەم بکاتەوە.

*هەموو هۆکار و ڕێگەیەك دەگرێتەبەر بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەی.

٢. ترس:

جەختکردنــەوە لەســەر فراوانــی دەســەڵات، هەســتێکی وا لای سەرکردەکان دروست دەکات. کە هەمیشە لە دەسەڵاتەکانیان بترسن، هەر کاتێکیش سەرکردە هەستی کرد مەترسی لەسەر دەسەڵاتەکەی دروستبورە، ئەوا متمانەی بەخۆی و دەوروبەرەکەی کەم دەبێتەوە، بەمەش کۆمەڵێك ڕێوشوێنی هەندێجار نایاسایی دەگرێتەبەر و هەوڵی بەهێزکردنی دەسەڵاتەکەی دەدات و لەئەنجامدا بەرەو تاکڕەوی دەچێت. ئەم جۆرە سەرکردانە ئارەزووی پیاهەڵدانیان هەیە، وەسفکردنیان لەڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی فراوانبوونی دەسەڵاتیان دەزانن، هەروەك (هیتلەر، مۆسۆلینی، ستالین، صدام،....هتد) بەکاریان هێناوە.

پرۆفیسۆر (لایبر) پێی وایە ئەو سەرکردانەی بەدرێژایی مێژوو ستەمکاربوون، هۆکاری پڕوپاگەندەیان کردۆتە ڕێگەی سەرەکی بۆ پاراستن و بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان، بەتایبەتی پاش سەدەی بیستەم کە هۆکارە تەکنەلۆژییەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەرەوپێش چوون.

- **سەرکردەی ڕووکەش و سەرکردەی ڕاستەقینە:**

سەرکردەی روکەش ئەو کەسانەن، کە لەڕێی هەڵبژاردنەکانەوە گەیشتونەتە دەسەڵات و بەشێوەیەکی ڕووکەش دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، بەڵام سەرکردەی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن، کە دەسەڵاتی

دروستکردنی بڕیار و فەرمان و جێبەجێکردنی هەر بڕیارێکی ئەو پارتەیان هەیە.

هەندێك پارتی سیاسی بڕوای بەم جۆرە دابەش بوون و جیاوازیکردنەی نێوان سەرکردایەتی پارتی سیاسی نییە، چونکە دەسەڵات لە تەنها کەسێکدا قۆرخ دەکرێت، هەروەك پارتەکانی (هیتلەر و مۆسۆلینی و ماوتسی تۆنگ و صدام و...هتد)، بەڵام پارتە سیاسییە ئەمریکییەکان نمونەی بەهێزی ئەم جیاوازیکردنەن، لەم پارتانەدا لەپشت ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتی سەرکردایەتیان لەدەستە چەند کەسێکیتر هەن، کە دەگونجێت لەشێوەی دامەزراوەیەکدا بن و بڕیاری سەرەکی و چارەنووسساز لای ئەوان دەربچێت، ئەوکەسە یاخود ئەو دامەزراوەیە کە خاوەنی کەسێتیەکی مەعنەوییە و پێی دەوترێت .(Boss)

لەراستیدا (Boss) کەسێکی خاوەن سەرمایەیە لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا لەپێناو بەدەستهێنانی دەنگەکان لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا بۆ پارتێکی سیاسی دیاریکراو، بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی و فراوانکردنی توانا ئابورییەکانی خۆی. (Boss) ئەو کەسەیە کە تێچوون و پێداویستیەکانی هەڵمەتەکانی ڕاگەیاندن و بانگەشە بۆ پارتێکی سیاسی لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا لەئەستۆ دەگرێت، هەربۆیە هیچ پارتێکی سیاسی نیە بتوانێت دەستبەرداری (Boss) بێت بەتایبەت لەو کۆمەڵگەیانەی دیموکراسین و بڕوایان بە جیاوازی سیاسی هەیە.

**پێنجەم: هەوڵدان بۆ گەیشتن بەدەسەلات:**

هەر پارتێکی سیاسی هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن بە دەسەلات، کاتێکیش باس لە دەسەلات دەکەین، مەبەستمان تەنها دەسەلاتی یەکەمی دەوڵەت و کۆمەڵگە نییە. بەڵکو دەکرێت پارتە سیاسیەکان لە ژینگە لاوەکیەکانیشدا دەسەلاتیان هەبێت، وەکو دەسەلاتی نوێنەرایەتیکردنی شارێك یان قەزا و ناحیە و تەنانەت گوندێکیش. پارتی سیاسی لەرێی دەسەلاتەوە دەتوانێت بەرنامەکانی بچەسپێنێت و پرەنسیپەکانی بەشێوەیەکی زیاتر بگەیەنێت. تاپارتی سیاسی دوور بێت لە دەسەلات. پرەنسیپ و بەرنامەکانی زیاتر لە بواری تیۆریدا دەمێنێتەوە. بەلام بە گەیشتنی ئەو پارتە سیاسیە بە دەستەلات دەتوانێت بەرنامەکانی بخاتە بواری پراکتیکەوە.

هەندێك پارتی سیاسی پێش گەیشتن بە دەسەلات بانگەشە بۆ پرەنسیپ و بەرنامەکانی دەکات و رای دەگەیەنێت کە لە خزمەت بەرژەوەندی گشتی دایە، بەلام پاش ئەوەی دەگاتە دەسەلات و بەرنامەکانی دەچنە بواری جێبەجێکردنەوە دەردەکەوێت کە تا چ رادەیەك بەرنامەکانی واقعیە و لەگەڵ خواست و داواکاری و کلتور و سیاسەتی کۆمەڵگەدا دەگونجێت و لە خزمەت بەرژەوەندی گشتی دایە.

بەمشێوەیە پێویستە هەر پارتێکی سیاسی سەرجەم ئەم رەگەزانەی تێدابێت و بە لەدەستدانی هەر یەکێك لەم رەگەزانە ئەو پارتە ئاستێکی فراوانی کارکردنی تووشی دارمان دەبێت. واتە ئەم رەگەزانە وەکو مەرج وان و پارتی سیاسی ناتوانێت دەستبەرداریان ببێت. لە بەرامبەریشدا بە بەهێزبوونی هەریەك لەم رەگەزانە پارتی سیاسی

بەهێزتر دەبێت و دەتوانێت بەشێوەیەکی فراوانتر بگاتە ئامانجەکانی و بەرژەوەندییەکانی پارت و کۆمەڵگە بەدی بهێنێت.

تا ساڵی ١٨٥٠ هیچ پارتێکی سیاسی بەم مانا نوێیەی ئێستا نەبوو، جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ناوچەکانی ئەمریکای ناوەڕاست و باکور. چونکە سەرهەڵدانی پارتی سیاسی بەشێوەیەکی گشتی بەسترابوو بە پێشکەوتنی سیستمی دیموکراسی، هۆکاری سەرەکی ئەمەش ئەو فراوانبوونە پلەبەندییە بوو کە لە مافی دەنگداندا ڕوویدا. واتە مافی هاوولاتی لە هەڵبژاردن و لە دەنگداندا. لەسەرەتادا مافی دەنگدان بۆ چینێکی دیاریکراو بوو، کە ئەوانیش خاوەن موڵك و پیشەگەرەکان بوون کە باجیان دەدا. بەمانایەکیتر مافی دەنگدان پەیوەست بوو بە بڕی باج. هەروەها تەنها نێرینە ئەم مافەی هەبوو، تاکو سەرەتای سەدەی بیست کە تیایدا مێینە توانی بەشداربێت لە دەنگداندا، بەم شێوەیە بەرەوپێشچوونێك لە سیستمی دیموکراسیدا بەدیهات.

لەبەرئەوەی لەسەرەتادا مافی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکان تەنها بۆ چینە کۆمەلأیەتیە بالأکان بوو، هەربۆیە پێویستی سەرهەڵدانی پارتی سیاسی لەئارادا نەبوو، بەلأم پاش فراوانبوونی مافی بەشداریکردن بەهۆی فراوانبوونی مافی دەنگدان پێویستی دروستکردنی پێکهاتەی سیاسی سەریهەڵدا، کە ناونرا بە"پارتی سیاسی". ئەم پەرەسەندنەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر بەهێزکردنی ڕۆڵی ئەنجومەنی نوێنەران، بەهۆی فراوانبوونی مافی دەنگدان نەدەکرا پاڵێوراوێك بە تەنها بتوانێت بانگەشە بۆ خۆی بکات و لەهەمان کاتدا دەنگێکی زۆر بەدەست بهێنێت، هەربۆیە پاڵێوراوەکان هەوڵیاندەدا هەماهەنگی بکەن لەگەڵ ئەو پاڵێوراوانەی کە بۆچوونی فکری و سیاسییان لەیەك نزیك بوو، ئەمەش وایدەکرد

جۆرێك لە دەستەگەری سیاسی دروست بکەن لە کاتی هەڵبژاردنەکاند، کە زۆربەی جار دروستکردنی پارتێکی سیاسی لێدەکەوتەوە، کەواتە دوو شێوازی سەرەکی سەرهەڵدانی پارتی سیاسی هەیە:

**یەکەم: سەرهەڵدانی پەرلەمانی و هەڵبژاردن:**

لەناو پەرلەمانەکان و ئەنجومەنی نوێنەرانەکاندا چەند ئەندامێك بۆچونیان لەیەکەوە نزیك دەبوو، یان هەمان هەڵوێست و بیرکردنەوەیان هەبوو سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو، لە کاتی گفتوگۆکاندا لەنێوان خۆیاندا و بە هەماهەنگی یەکتری فراکسیۆنێکی تایبەتیان دروست دەکرد بۆ پتەوکردن و بەوگریکردن لە بۆچونەکەیان، کە دواتر ئەو فراکسیۆنە لە شێوەی پارتێکی سیاسیدا دەردەکەوت.

سەرەڕای ڕێککەوتن لەسەر بۆچوون و هەڵوێستە سیاسی و فکرییەکان، هۆکاری جوگرافی و هۆکاری پیشەیی، دوو هۆکاری کاریگەر بوون لەسەر دروستبوونی پارتی سیاسی. ئەم دوو هۆکارە (پیشەیی و جوگرافی) وای دەکرد ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و پەرلەمانەکان کە لە هەمان ناوچەوە هاتوون یان هەمان پیشەیان هەیە، لە دەوری یەکتری کۆببنەوە و فراکسیۆنێکی تایبەت دروست بکەن. هەندێك جار ئەم دوو هۆکارە کاریگەرییان زیاترە لە هۆکاری هاوهەڵوێستی فکری و سیاسی. بەم شێوەیە ئەو فراکسیۆن و تەکەتولانەی کە لەناو پەرلەمان و ئەنجومەنی نوێنەراندا دروست دەبوو، سەرهەڵدانی پارتێکی سیاسی لێدەکەوتەوە.

بەشـێوەیەکی گـشتی سـەرهەڵدانی پەرلـەمانی پـارتی سیاسـی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەبووە بە فراوانبوونی مافی دەنگدان.

**دووەم: سەرهەڵدانی دەرەکی:**

مەبەسـت لـە سـەرهەڵدانی دەرەکـی واتـە لـە دەرەوەی پەرلـەمان و ئەنجومەنی نوێنەران لەلایەك، دوور لە کاریگەری پرۆسەی هەڵبژاردن بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ لەلایـەکیتر، ئەمـەش مانـای ئـەوە نییـە کـە کاریگەری پرۆسەی هەڵبژاردن لەسەر ئەم شێوازەی سەرهەڵدانی پارتی سیاسی نییە. بەڵام مانای وایە لێرەدا ئەم کاریگەرییە کەمترە.

**گرنگترین سەرچاوەکانی سەرهەڵدانی دەرەکی پارتی سیاسی بریتیەلە:**

* کۆمەڵە کلتورییەکان.
* یانەکان.
* سەندیکاکان.
* ڕۆژنامە و دەزگا ڕاگەیاندنەکان.

ئەوەی جێی سەرنجە، زۆربەی پارتە سۆشیالیستەکان سەرهەڵدانیان دەرەکیـە، دروسـتبوونی زۆربـەی ئـەم پارتانـە لـە دەوڵـەتانی ئـەوروپا بەهۆی بەرەوپێشچوونی کاری سەندیکاکانەوە بووە، هەروەها کۆمەڵەی هەرەوەزی و کرێکاری و دەستەگەرە کرێکارییەکانی جوتیاران ڕۆڵێکـی سـەرەکییان هـەبووە لـە دروسـتبوونی پـارتی سیاسـی کـە نـاونراوە بـە پارتی کشتوکاڵی، هەرچەندە پارتی کشتوکاڵی کەمتر گەشەی کـردووە بە بەراورد لەگەڵ پارتی کرێکاریدا، بەڵام کاریگـەر بووە لە هەندێك لە

دەوڵەتانی ئەورووپا و ئەمریکا، بە تایبەت دەوڵەتانی ئەسکەندەنافیا و کەنەدا، هەروەها ڕێکخراوەکانی خوێندکاران (زانکۆ) و تەکەتولی زانکۆکان ڕۆڵیان هەبووە لە دروستکردنی پارتی سیاسی بەتایبەت پارتە سۆشیالستی و پارتە چەپەکان.

جۆرێکیتر لەو کۆمەڵانەی کە کاریگەرییان هەبووە لە سەرهەڵدانی پارتی سیاسی. بریتیەلە کۆمەڵەی نهێنی و کۆمەڵەی قەدەغەکراو.

- کۆمەڵەی نهێنی: ئەو کۆمەڵەیەیە کە ڕێگەی پێدەدرێت کار بکات، بەلاّم بە ویستی خۆی نایەوێت بەئاشکرا کاربکات، لەکاتی بوون بە پارتێکی سیاسیدا پێویستە ئەم کۆمەڵەیە لە بواری نهێنیەوە بچێتە بواری ئاشکراوە، بەوپێیەی پارتی سیاسی نابێ نهێنی بێت.
- کۆمەڵەی قەدەغەکراو: ئەو کۆمەڵەیەیە، کە پێشتر هەبووە بەشێوەیەکی ئاشکرا، بەلاّم دواتر بەهۆی بارودۆخێکەوە ڕێگەی کارکردنی لێدەگیرێت، لە کاتی بوون بە پارتی سیاسیدا دەبێتە پارتێکی سیاسی قەدەغەکراو.

کۆمپانیا و دامەزراوە پیشەسازی و بازرگانی و بانك و پرۆژە ئابورییە گەورەکان، ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە سەرهەڵدانی پارتی سیاسیدا، هەروەك لە ساڵی ١٨٥٤ هەریەکە لە "بانکی مۆنتریاڵ (Montreal Bank)، کۆمپانیای ترۆنگ (Throng Company) و دامەزراوەی بازرگانی مۆنتریاڵ (Big Business of Montreal) پارتی پارێزگارانی کەنەدایان دامەزراند. لەئێستادا ڕۆڵی کۆمپانیا و دامەزراوە بازرگانییەکان لەسەر پرۆسەی سیاسی و ئیداری فراوانتر بوە، بەجۆرێك کە کۆمپانیا بازرگانیە زەبەلاحەکان تارادەیەکی فراوان کۆنترۆڵی کاری پارتە سیاسییەکانیان کردووە و بەهۆی ئەو برە

بەخشینەوە کە سەرمایەدارەکان دەیدەنە پارتە سیاسییەکان، توانراوە کاریگەری لەسەر بڕیارەکانی پارتی سیاسی بەجێ بهێڵن. ئەم حاڵەتەش زیاتر لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی ئەورووپا و ئەمریکادا بوونی هەیە. بەوپێیەی داهاتی پارت و سەرچاوەی دارایی لەو وڵاتانەدا زۆربەی کات پەیوەستە بەو بڕە هاوکارییانەی کە لەلایەن سەرمایەدار و کۆمپانیاکانەوە دەبەخشرێتە پارتە سیاسییەکان. بەدڵنیاییشەوە سەرمایەدار و کۆمپانیاکان بەبێ وەرگرتنی بەرامبەرێکی سیاسی و ئابووری ئەو بڕە سەرمایەیە نادەنە پارتە سیاسییەکان. ئەمەش واتە دروستکردنی کاریگەری لەسەر شێوەی بەڕێوەچوونی کارە سیاسی و ئیدارییەکان.

**مەبەستی سەرەکی لە دروستبوونی پارتی سیاسی بەشێوازی دەرەکی بریتییەلە:**

١. هەندێک لەو پارتانە وەک بەرهەڵستکاری دەسەڵات دروست دەبوون و داوایان دەکرد نوێنەریان لە پەرلەمانەکاندا هەبێت.

٢. هەندێکی دیکە لەو پارتانە لەکاتێکدا دروستبوون، کە وڵات داگیرکرابوو، لەپێناو ڕزگارکردنی وڵات لە داگیرکەر بە ئاشکرا یان بە نهێنی دروست دەبوون.

گرنگترین جیاوازی نێوان سەرهەڵدانی پەرلەمانی و سەرهەڵدانی دەرەکی پارتی سیاسی بریتییەلەوەی ئەو پارتە سیاسییانەی بەشێوەیەکی دەرەکی سەرهەڵدەدەن، زیاتر مەرکەزین لە پێکهاتەی ڕێکخستندا، لەچاو ئەو پارتانەی کە لەناو پەرلەمانەکاندا

سەرهەڵدەدەن. تا ساڵی ١٩٠٠ زۆرینەی سەرهەڵدانی پارتە سیاسییەکان سەرهەڵدانی پەرلەمانی و هەڵبژاردن بوو. جگە لە پارتە کاسۆلیکیەکان، وەك پارتی پارێزگارانی بەلجیکا، هەروەها ئەو پارتانەی لە کۆمەڵەی کلتورییەوە دروستبوون وەك پارتی کرێکارانی بەریتانیا، لەگەڵ هەندێك پارتی دیکە، کە لەسەر دەستی دامەزراوەی ئابوری گەورە دروستبوون، بەڵام بەپێچەوانەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە واتە لە ١٩٠٠ بەدواوە سەرهەڵدانی دەرەکی بوە ڕێسا و سەرهەڵدانی پەرلەمانیش بووە (استثناء).

لە ئەمریکای لاتین بەهۆی زوو وەرگرتنی سەربەخۆیی ئەو دەوڵەتانەوە سەرهەڵدانی پارتی سیاسیش بە بەراوورد لەگەڵ ناوچەکانی تردا، بەشێوەیەك پێش نزیکەی سەد و حەفتا ساڵ و پاش وەرگرتنی سەربەخۆیی لە ئیسپانیا چەندین پارتی سیاسی دروستبوون، بەڵام شێوازی هەرە سەرەکی دروستبوونیان بریتیە لە شێوازی دەرەکی لەبەر دوو هۆکار:

١. زۆربەی هەرە زۆری ئەم وڵاتانە لە ژێر داگیرکاری ئیسپانیادا بوون.

٢. لەم وڵاتانە ڕێژەیەکی زۆر یانەی کلتوری و سەندیکا و گروپەکان هەبوون.

لەدوای دروستبوونی ئەم پارتە سیاسیانەشەوە دوو جۆر لە ئاراستەی حزبی دروستبوو، یەکەمیان ئاراستەیەکی محافزکار، کە هەوڵی دەدا پارێزگاری لەو دەسەڵاتە بکات. کە لە دەستیدایە. ئاراستەی دووەمیش لیبرالیەکان بوون، کە بەردەوام داوای گۆڕانکاری

له دهسهلاّت و نوێگهرییان دهكرد. بهمهش جۆرێك له ململانێی حزبی سهریههڵدا كه تا ئهمڕۆش بهردهوامه.

به ههمان شێوه له ئاسیا و ڕۆژههلاّتی ناوهڕاست، ولاّتهكان كهوتبونه ژێر داگیركاری ولاّتانی دیكه. ئهمهش بوه ڕێگر له بهردهم سهرههڵدانی پارته سیاسییهكان. جگه لهو پارته سیاسییانهی بۆ كۆمهڵێك مهرامی داگیركارییانه دروست دهكران. بهلاّم پاش وهرگرتنی سهربهخۆیی له بهشێك له دهوڵهتهكاندا پارتی سیاسی دروستبوون، ههرچهنده بههۆی سیستهمه دیكتاتۆرییه نێوخۆییهكانهوه سهرههڵدانی پارتی سیاسی له چوارچێوهیهكی تهسكدا مایهوه.

لە کۆمەڵگەی سیاسیدا دوو هێزی سەرەکی هەن:

١. هێزی دەسەڵاتدار: کە لەپێناو پاراستنی دەسەڵاتەکەی کاردەکات و ئارەزووی شکست و وازهێنان لەو دەسەڵاتە ناکات و هەوڵدەدات زۆربەی هۆکارەکان بەکاربهێنێت بەمەبەستی مانەوەی دەسەڵاتەکەی، هەندێجار ئەم هێزە پێیدەوترێت هێزی کۆنەپەرست (رجعی).

٢. ئەوانەی دەسەڵاتیان نییە و گوێرایەڵ و ملکەچی ئەو بڕیارانەن کە هێزی یەکەم دەریدەکات. ئەمانە هەندێکجار ئارەزووی ڕوودانی گۆڕانکاری دەکەن لە هەرەم و پێکهاتەی دەسەڵاتدا، چونکە هەر گۆڕانکارییەك بکرێت، لە بەرژەوەندی ئەم هێزەدایە. کە پێی دەوترێت نوێخواز (تقدمی).

لە نێوان ئەم دوو هێزەدا ململانێیەکی بەردەوام هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، لەوانە:

١. دەسەڵاتی فراوانی هێزی دەسەڵاتداران، کە توانیویانە بەو ئیمتیازە مادی و مەعنەویانەی هەیانە، کۆنترۆڵی بوارە سیاسی و ئابوری و کلتوری و فکری و کۆمەڵایەتیەکان بکەن.

٢. ئەزموونی هێزی دەسەڵاتدار وای کردووە بەهێز بن و توانای بەرەنگاربونەوەی گۆڕانکاریەکانیان هەبێت.

٣. هێزی دەسەڵاتدار هەمیشە دەزانێت چی دەوێت و چی لەسەرە ئەنجامی بدات، لەبەرئەوە ئامانجی ڕوونە و دەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکاندا بکات.

٤. ڕای گشتی زۆربەی کات هاوبۆچوونی هێزی دەسەڵاتدارە لەبەر چەند هۆکارێك:

أ. راهاتن لەسەر حاڵەتی ملکەچی بۆ دەسەلأت.

ب. ترس لەهەر شتێکی نوێ، کە دێتەپێش.

ت. کاریگەری دەزگا و دامەزراوەکانی راگەیاندن کە لە زۆربەی حاڵەتدا موڵکی دەسەلأتدارە.

لە بەرامبەر ئەم هۆکارانەدا هێزی دووەم هەوڵ دەدات بەسەر ئەم هۆکارانەدا زاڵ بێت و ئامانجەکانی خۆی بەدی بهێنێت بەمەش ململانێیەکە بەردەوام دەبێت.

بۆ بەڕێوەبردن و درێژەدان بەو ململانێ سیاسیەی لەنێوان ئەو دوو هێزەدا هەیە، پێویستە تیمێکی لێبڕاو هەبێت کار بکات بۆ دروست کردن و بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان پارتی سیاسی و جەماوەر. بە مەرجێك لەو پارتە سیاسیەدا ڕێژەی نوێخوازان لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە لەوانەی کە بڕوایان بە نوێکردنەوە نیە، زیاتر بێت. ئەو کەسانەی کە ئەو ململانێیە بەڕێوە دەبەن پێیان دەوترێت کادری سیاسی، کە پێویستە ئەم سیفاتەی خوارەوەیان تێدا بێت:

١. لە بناغەدا کەسێکی نوێخواز و خاوەن فکر و بەرنامە. بڕوای بە گۆڕانکاری هەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەو گۆڕانکارییە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆشی بگرێتەوە.

٢. بڕوای بە مافی جەماوەر هەبێت و کار بکات بۆ بەرتەوامبوون و پتەوکردنی پەیوەندی نێوان پارتی سیاسی و جەماوەر.

٣. خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی بەرچاو و لێهاتوویەکی زانستی بێت و کەسایەتییەکی دیاری هەبێت.

٤. بڕوای بە گرفتەکانی کۆمەڵگە هەبێت و توانای لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی هەبێت.

٥. بەرنامە و ئامانج و پرەنسیپەکانی پارتەکەی لا ئاشکرابێت و بڕوای تەواوی پێی هەبێت.

**ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسییەکان**

ئەگەر تەماشای کۆمەڵگەکانی جیهان بکەین، دەبینین بەشێوەیەکی سروشتی پێکهاتەی هەر کۆمەڵگەیەك دابەش کراوە بۆ دوو چین، یەکەمیان ئەو چینەیە کە دەسەڵات بەڕێوەدەبات بەویستی خۆی و بەپێی ئەو سیستەمەی باوەڕی پێی هەیە و پیادەی دەکات، کۆمەڵگە بە ئاراستەی بیرکردنەوە و سیاسەتەکانی خۆیدا دەبات و لە دەرەنجامیشدا چینی دووەم دروست ئەبێ کە دەبێتە گوێڕایەڵی فرمانەکانی دەسەڵات، بەڵام ئەوەی دەبێتە خاڵی جیاوازی نێوان کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان و کۆمەڵگە دواکەوتووەکان، ئەو خاڵەیە کە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا دەسەڵات وابەستەی دەستوور و یاسایەکی پتەو نیە، کە لە ڕێیەوە تاکەکان بتوانن لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا بکەن، کە خۆیان لە پرۆسەیەکی ئازاد و دیموکراتیدا دیارییان کردووە، بەڵام بەپێچەوانەوە لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا یاسا و دەستوور باڵادەستن و کاربەدەستانی حکومەت و دەوڵەت دەبنە فەرمانبەرێکی جێبەجێکاری ئەو یاسایانە، کە سەرجەمیان لە بەرژەوەندی تاکەکاندا داڕێژراون. بەهەمان شێوەش لەهەر پارتێکی سیاسیدا ئەم دوو چینە بوونی هەیە و پارتە سیاسییەکانی دابەشکردووە بەسەر دوو چینی سەرەکیدا، کە چینێکی دەسەڵاتدار و چینێکی فەرمانڕەواکراوی بەرهەم هێناوە و بەپێی جیاوازی ئاستی کۆمەڵگەکان و بیرکردنەوە و ئایدیۆلۆژیاکانیان، لەنێوان ئەم دوو

چینەشدا بەردەوام ململانێیەك هەیە، كە لە هەندێ حاڵەتدا توندوتیژی و دژایەتی و نائارامی بەرهەم دەهێنێت و لە هەندێکی دیکەشدا ململانێکان ئاشتی و پێکەوەژیان بەدی دەهێنن، بەڵام تایبەتمەندی ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسییەکان لە وڵاتانی دواکەوتوو بە گشتی و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی بریتییە لەوەی ئەم ململانێیانە توندوتیژییان بەرهەم هێناوە و لە دەرەنجامدا ئەو حاڵەتە دروستبووە، کە بە فرەمینبەرییەکی دەناسرێت و هەندێجار ئەو فرەمینبەرییە لەبری پێکەوەژیان، دابەشبوون و دابڕانێکی فراوانی بۆ پارتە سیاسییەکان دروست کردووە.

## چەمکی ململانێ:

بیرمەند (بۆلدینگ Boulding) پێی وایە ململانێ هەڵوێستێکە کە تایبەتمەندی سەرەکی تیایدا بریتییە لە کێبڕکێ و لایەنەکانی دەزانن خاڵە ناکۆکەکانیان چییە و بۆ گەیشتن بە ئامانجێك لەسەر حسابی لایەنەکەی دیکە هەوڵدەدەن .

بەڵام بەلای بیرمەند (پۆندی Pondy)یەوە ململانێ بریتییە لە داڕمان و لەکارکەوتنی هۆکار و میکانیزمەکانی دروستکردنی بڕیارێکی یەکلاکەرەوە.

هەروەها لێکۆڵیار (ڕۆبنز Robbins) پێی وایە ململانێ ئەو پرۆسەیەیە، کە تیایدا تاکێك هەوڵ دەدات هەوڵەکانی تاکێکی دیکە بچوك بکاتەوە و بەرژەوەندییەکانی خۆی لەسەر حسابی ئەوی دیکە بەدی بهێنێت، لە ئەنجامیشدا دەبێتەهۆی بێومێدکردنی کەسی بەرامبەر.

ململانـێ بەشێوەیەکی گشتی ئەو ناکۆکییەیە کـە لـە دەرەنجـامی جیـــاوازی بیرکردنـــەوە و ئایـــدیۆلۆژیا و هـــزر و پرۆگـــرام و بەرژەوەندییەکانەوە دروست دەبێت لەنێوان دوو گروپ یان زیاتر.

بەڵام ململانێ یاسایەکە کە کاردەکاتە سەر پەیوەندییەکانی مرۆڤ و یاسـاکانی ژیـان و ئامـانجی سـەرەکی گەیـشتنە بـە دەسـەڵات. لـە چوارچێوەی هەریەوڵەتێکیشدا چەندین شێوازی ململانـێ هەیە وەك (ململانێـی فـەرمانڕەوا و گـەل. ململانێـی نێـوان پارتـە سیاسـییەکان و دەسـەڵات. ململانێـی نێـوان پارتـە سیاسـییەکان، ململانێـی نێـوان تاکەکانی کۆمەڵگە.....هتد) لەسەر ئاستی دەرەکیش ململانێی نێوان دەوڵەتەکان هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی خاڵەکانی هێز.

بەپێی شوێنی ڕوودانی ململانێکان دوو جۆرن، کە بریتین لە:

**یەکەم: ململانێ دەرەکیەکان:**

ئـەو ململانێیانـەی دەوڵـەتن لەگـەڵ لایەنـەکانی دەرەوەی وڵات و بەرەنگاربونـەوەی بـەپێی پێـوەرە نێودەوڵەتیـەکان، ئەمـەش هەنـدێجار بـەپێی بنەمایـەکی سیاسـی یـان ئـابووری یـان سـەربازی دروسـت بـوە، بەڵام چارەسەرکردنی ئەم جۆرە ململانێیە لەهەر ئاستێکدا بێت یـەکێك لەم دوو بەرهەمەی دەبێت:

١. ڕێگای یەکەم بۆ چارەسـەرکردنی ململانـێ دەرەکیـەکان بریتیـە لـە ڕێگاچـارەی ئاشـتیانە، کـە لـە زۆربـەی کاتـدا لـەڕێی پرۆسـەی دانوسـتانەکان چارەسـەر دەکرێ، بەتایبـەتی ئەگـەر لـە دانوسـتانەکاندا پێوەرە سـەرەکیەکانی بنیاتنـانی ئاشـتی پـەیڕەو بکرێـت و هـەنگاو و ئاراستەکانی کارکردنی گروپەکانی نێو دانوستان بە ئاراستەی کۆتایی

پێهێنـانی ئـەو ململانێیـە بێـت، بـەڵام دەکـرێ هەنـدێجاریش بـەهۆی پـــەنابردن بـــۆ میکانیزمـــە نێودەوڵەتیـــەکانی وەك دادوەری (تحکـــیم نێودەوڵـــەتی کـــە یەکێکـــە لـــە هۆکارەکـــانی یەکلاکردنـــەوەی کێـــشە نێودەوڵەتییەکان بە شێوازی ئاشتیانە و لە مێژەوە وەك میکـانیزمێکی چارەسـەرکردنی ململانـێ نێودەوڵەتیـەکان پـەنای بـۆ بـراوە لـە پێنـاو بەدیهێنانی ئاشتیدا. هەروەها هەندێکجار سەرکەوتنی ئەم ڕێگەچارەیە لـە یەکلاکردنـەوەی کێـشەکاندا هۆکارێکی گـرنگ بـووە بـۆ پەیـداکردنی متمانەی زیاتر لای دەوڵەتان بۆ ئەوەی زیاتر پەنای بۆ ببەن.

٢. ڕێگاچـارەی دووەم بـۆ چارەسـەرکردنی ململانـێ دەرەکیـەکان بریتیـە لـە پـەنابردن بـۆ میکانیزمـە توندوتیـژەکان کـە لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا جـەنگی لـێ بەرهـەم هـاتووە. ئەگەرچـی چارەسـەرکردنی کێـشە و قـەیران و ململانێکـان لـەڕێی جەنگـەوە بـەپێی پێـوەر و یاسـا نێودەوڵەتیـــەکان قەدەغـــە کـــراوە و بـــەکارهێنانی هێـــزی ســـەربازی پێویستی بە ڕەزامەندی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەیە، بەڵام لەراستیدا ئەم شێوازە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا باوترین ڕێگایە کە هێز و دەوڵەتەکان بـۆ یەکلاییکردنـــەوەی ململانێکانیـــان بـــەکاری دەهێـــنن. بـــەلام ئـــەم ڕێگاچارەیە پێچەوانەی پێوەرە مرۆییەکانە.

**دووەم: ململانێ ناوخۆییەکان:**

ئەو ململانێیانەن کە لە ناوخۆی کۆمەڵگەدا ڕوودەدەن لەنێو پێکهاتە جیاوازەکانـدا، وەکـو ململانـێ سیاسـیەکان و ململانـێ نەژادییـەکان و ململانێی نێوان ڕەنگ و نەتەوە و مەزهەب و ئاینە جیاوازەکان.

ململانێ ناوخۆییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگەکان بە دوو ئاراستەی جیاوازدا ئاراستە دەکرێن، کە بەشێوەکی گشتی دوو جۆرە ململانێ بەرهەم دەهێنن، کە بریتین لە:

١. ئەو ململانێیانەی سروشتێکی توندوتیژانەیان هەیە، وەکو ئەو ململانێیانەی خوێناویین لایەنەکانی کار بۆ سڕینەوەی لایەنی بەرامبەر دەکەن و بە هیچ جۆرێك بروایان بە پرەنسیپی (وەرگرتن و پێدان – الاخذ و العطاء نیە. کە وەك بنەمایەکی سەرەکی بۆ چارەسەرکردنی ململانێکان پشتی پێدەبەسترێت. نمونەی ئەم ململانێیانە لە ناو کۆمەڵگەکانی وڵاتانی ئەفریقیادا هەبوە. بەتایبەت کاتێك ئەو کۆمەڵگایانە لە چەندین ڕەگەز و نەژاد و نەتەوە و ڕەنگ و ئاین و ئاینزا و بیرکردنەوەی جیاواز پێکهاتوون و لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووەوە تا ئێستاش لە بەشێکی زۆری وڵاتانی ناوەراست و باشووری کیشوەری ئەفریقیا زۆرینەی ململانێکان بە ڕێگایەکی خوێناوی لەنێو پێکهاتە جیاوازەکاندا کۆتایی پێدەهێنن.

٢. ئەو ململانێیانەی سروشتێکی ئاشتیانەیان هەیە، ئەمەش ئەو ململانێیانەن کە لە چوارچێوە یاسایی و ڕێساکانی کۆمەڵگە دەرناچن و تیایدا لایەنەکان سەرەڕای بوونی ناکۆکیەکان پەنا بۆ هەنگاوە ئاشتیخوازانەکان دەبەن، لێرەدا ناکۆکیەکان هەرچەندە فراوان بن و لە لوتکەدا بن، بەڵام لایەنە ناکۆکەکانی ململانێ نایانەوێت بەهیچ جۆرێك پەنا بۆ توندوتیژی ببەن لە چارەسەرکردنی هۆکارەکانی دروستبون و گەشەسەندن و گەورەبوونی ئاستی ململانێکان. لەنموونەی ئەم ململانێیانەش ململانێی نێوان پارتە سیاسیەکان لە سیستەمێکی فرەحزبیدا کە پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ دیموکراسیەت،

دیموکراسیەتبوونی نیە بەبێ بوونی فرەحزبی، هەروەك هەندێ لە بیرمەندان پێیان وایە دیموکراسیەت واتە حکومەتی فرەحزبی. ئەم دیموکراسیەتەش چەندین ناوی لێنراوە وەك (دیموکراسیەتی رۆژئاوا. دیموکراسەتی لیبرالی، دیموکراسیەتی فرەیی)،.....هتد. لێرەدا لایەنە ناکۆکەکانی نێو ململانێ هەوڵ دەدەن لە جیاوازییەکانیانەوە پێکەوەژیان دروست بکەن هەمووان پێکەوە کاروبار و ئەرکەکانی کۆمەڵگە و دەوڵەت و هاوولاتیان بەرێوەدەبەن.

**ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسیەکان:**

ئەرکی سەرەکی پارتە سیاسیەکان لە کۆمەڵگە فرەحزبیەکاندا بریتیە لە بەرێوەبردنی ململانێی سیاسی لە کۆمەڵگەدا بەوپێیەی پارتی سیاسی جۆرێکە لەرێکخستنەکانی کۆمەڵگە و ئارەزووی بەئەندامبوون تیایاندا یەکێکە لە غەریزە سەرەکییەکانی مرۆڤ، هەربۆیە لە مرۆڤەکانیش لایەنداری خۆیان بۆ لایەنێك یەکلایی کردۆتەوە و بەمەش فرەلایەنییەك دروستبووە کە لەنێوانیاندا کێبڕکێیەك سەریهەڵداوە. ئەم کێبڕکێیەش چەندین شێوازی وەرگرتووە وەك ململانێی توندوتیژیانە و ململانێی ئاشتیانە، باشترین شێوازی ململانێش بریتیە لە ململانێیەکی ئاشتیانەو پارتی سیاسی سەرەکیترین دەزگا و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەیە بۆ دوورخستنەوەی کۆمەڵ لە ململانێیەکی توندوتیژانە. ئەم ئەرکەش پێویستی بە چەند تایبەتمەندییەك هەیە کە پێویستە لەهەر پارتێکی سیاسیدا گرنگیەکی تایبەتی پێ بدرێت بۆ بەرێوەبردنی ململانێی سیاسی.

یەکێك لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی لە پارتە سیاسیەکاندا پێویستە بوونی هەبێت بریتیە لە ڕادەی فراوانی بنکەی جەماوەری پارتی سیاسی و بڵاوبوونەوەی لە سەرتاسەری وڵاتدا، لەنێو ئەو بنکە جەماوەرییەدا بەشێکی دیاریکراو لە ئەندامانی پارتی سیاسی هەن، بەوپێیەی ئەو ئەندامانەش -بەپێی پێناسەی پارتی سیاسی- هەڵگری بۆچوونی لەیەك نزیکن و تێڕوانینیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان تاڕاددەیەك مەرج نیە وەك یەك بێت. هەربۆیە لەنێو ئەندامانی ئەو پارتە سیاسیەدا هەندێجار ئەو لێك نزیك نەبوونە دەبێتە سەرەتای سەرهەڵدانی جیاوازییەکی فراوان کە بنەماکانی کار هاوبەشی نێوان ئەندامان دەخاتە مەترسییەوە، کە ئەمەش دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی لەناو پارتە سیاسیەکاندا، خودی ئەم ململانێیەش یان دەبێتەهۆی لاوازبوونی پارتی سیاسی یان دەبێتەهۆی دابەشبوونی ئەو پارتە و پەرتبوونی.

- **هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسییەکان:**

بۆ ئەو ململانێ ناوخۆییەی لەنێو پارتە سیاسیەکاندا دروست دەبێت کۆمەڵێك هۆکار هەن کە هەریەکەیان مەودا و کاریگەریی بەپێی ئاستی ململانێکە دەگۆڕێت و خودی ململانێکەش بە ڕاددەی کاریگەری ئەو هۆکارانە دەتوانرێت کاریگەرییان دیاری بکرێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هۆکاری دروستبوون و بەردەوامبوونی ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسیەکان بریتیە لە:

١. جیاوازی تەمەن و ئەزموون:

بۆچـوونێکی دیـار هەیـە کـە دەڵێـت (بەتەمەنـەکان محافزکـار و گـەنجانیش گۆڕانخـوازن)، ئەمـەش بەومانایـەی هەمیـشە گـەنجان ئارەزووی گۆڕانکاریکردن لە واقع و ئەو بارودۆخە دەکەن کە تیایدان، هەربۆیە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین بەشێکی هەرەزۆری شۆڕش و گۆڕانکارییەکان لە کۆمەڵگەکاندا لەسەر دەستی گەنجان ئەنجامدراوە، بەوپێیەی هەمیشە گەنجان هەستێکی نوێخوازییان تێدایە لە زۆربەی کاتدا گۆڕینی کلتور و سیاسەت و ڕەهەندەکانی دیکەی کۆمەڵگە زیاتر بە گەنجان ئەنجام دەدرێت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئەوانەی بەتەمەنن وەکو ڕێسایەك هەمیشە دەیانەوێت پارێزگاری لە باردۆخەکە بکەن و ڕوودانـی هەر گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بە کارێکی گونجاو نازانن، ئەمەش وایان لێدەکات ببنە کەسێکی محافزکار.

ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد بریتیە لەو ڕێسا سەرەکییانەی گەنجان و بەتەمەنەکانی نێو پارتە سیاسیەکانیان پێدەناسرێتەوە، بەڵام هەندێکجار کەسانێك هەن لەو ڕێسایە لادەدەن، بۆ نموونە دەکرێت گـەنجێکی پـەروەردەبووی نـاو بنەماڵەیـەکی محافزکـار سروشـتێکی محافزکارانەی هەبێت و بیەوێت پارێزگاری لە بارودۆخ بکات و بڕوای بـە هـەر گۆڕانکارییـەك نـەبێت، بەتایبـەتی ئەگـەر ئـەو گۆڕانکارییـە کاریگـەری نێگـەتیڤ دروست بکات لەسەر پێگەی ئەو گەنجە لەناو پـارتی سیاسـیدا و زیـان بـە بەرژەوەندییـەکانی بگەیـەنێت، یـان دەگونجێت کەسێکی بەتەمەنی تێکەڵبوو لەگەڵ گەنجانی گۆڕانخوازدا سروشـتێکی نوێگەرییانـەی هـەبێت و هەمیـشە ئـەویش هـەوڵی گۆڕانکاری بدات.

له زۆربەی پارتە سیاسیەکاندا جیاوازی ئەزموون و تەمەن کراوەتە مەرجێکی سەرەکی گرتنەدەستی دەسەلآت و بەشداربوون لە بڕیاردان لەناو پارتێکی سیاسیدا. بەتایبەت لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا، ئەمەش لە پەیڕەو و پڕۆگرامی ناوخۆی زۆربەی ئەو پارتانەدا بە ئاشکرا دەبینرێت، هەروەك لە زۆرجاردا تەمەنی (١٨) ساڵ یان (١٦) ساڵ وەك پێوەری بەئەندامبوون دیاریکراوە، لەپاڵ ئەمەشدا بەدەستهێنانی ئەزمونێك لە کارکردنی حزبی لە یەکێك لە ئۆرگانەکانی پارتی سیاسیدا کراوەتە مەرج بۆ خۆپالآوتن و بەدەستهێنانی پۆستە بالآکانی ئەو پارتە. بەدڵنیاییەوە پەیداکردنی ئەم ئەزموونە پێویستی بە بەسەربردنی تەمەنێك هەیە، هەربۆیە ئەم پرۆسەی ئەو هەستە لای گەنجان دروست دەکات کە ئەوان لە پرۆسەی بڕیاردروستکردنی پارتەکەیان بەشدارنین و بڕیار و سیاسەتی کاری بەتەمەنەکانیش بەگونجاو نازانن و پێیان وایە بەپێی یاسا ئەو دەسەلآتەیان قۆرخ کردووە، کە لێرەدا یاسای پارت بریتیە لە پەیڕەو و پڕۆگرامی ناوخۆی ئەو پارتە. لێرەوە گەنجان بۆ کاریگەری دروستکردن بەمەبەستی ئەنجامدانی گۆڕانکاری دەکەونە ململانێوە لەگەڵ بەتەمەنە دەسەلآتدارەکان و لە بەرامبەریشدا بەتەمەنەکان بەمەبەستی ڕێگرتن لە ڕوودانی هەر گۆڕانکارییەك لەگەڵ گەنجاندا دەکەونە ململانێوە، بەمەش هۆکاری ئەزموون و تەمەن دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆ لە پارتە سیاسیەکاندا.

لە بەرامبەر ئەم حاڵەتەدا لە بەشێکی زۆری وڵاتانی پێشکەوتوودا زۆرجار گەنجێکی خاوەن مەعریفە و توانا بە ئاسانی ڕێگەی پێدەدرێت بەشداربێت لە بڕیاردان، جا ئەم پێگەیە چ لە ئاستە بالآکانی حزبدا بێت

یـان لـەو پۆسـتە حکومیانـەی کـە پارتـە سیاسـیەکان لـە ئـەنجامی هەڵبژاردنەکانـەوە بەدەسـتی دەهێـنن، بەومانایـەی لـەناو ئـەو پارتـە سیاسـیانەدا تەمـەن نەکراوەتـە پێـوەری سـەرەکی بەدەسـتهێنان یـان لەدەسـتدانی پۆسـتێکی سیاسـی بـالاّ، لـە گـرنگترین نموونـەی ئـەو کۆمەڵگەیانـەش ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و ئـەوروپای رۆژئاوان کە بە ڕوونی ئەم حاڵەتەی تێدا بەدی دەکرێت.

## ٢. جیاوازی پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی:

بەهۆی جیاوازی کۆمەلاّیەتییەوە لـەناو پـارتێکی سیاسیدا هەنـدێك ململانێـی سیاسـی سـەرهەڵدەدات، ئـەو کەسـەی لـە خێزانێکـی سـەرمایەدار و محافزکـار پـەروەردە دەبێـت زۆرجـار دژی هـەر گۆڕانکارییەکە کە لە سودی چینی هەژاران بێت، چونکە لەئەنجامدا ئەو گۆڕانکارییـە دژی بەرژەوەندییـەکانی ئەرسـتۆکراتیەکانە (سەرمایەدارەکان) یان لانی کەم ئەو گۆڕانکارییە بەرژەوەندی زیاتریان بۆ بەدی ناهێنێت، بەهـەمان شێوە چینی هـەژارانیش هەمیشە هـەوڵی گۆڕانکاری دەدەن بەوپێیەی هەر گۆڕانکارییەك بارودۆخی ژیانی ئەوان دەگۆڕێت، لەدەرەنجامیشدا ئەگەر سەرکەوت ئەوا سوودمەند دەبێت، ئەگەر سەریشنەکەوت ئەوا هیچ لەدەست نادات، چونکە خاوەنی هیچ نیە تـا لەدەسـتیبدات. لـەنێوان ئـەم دووچینە چینی ناوەنـد هەیـە کـە زۆرجار لایەنگری خۆی بۆ یەکێك لەو دووچینە یەکلایی دەکاتەوە.

سەرهەڵدانی ململانێی پەوەندیدار بە پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی پارتێکی سیاسیەوە هەندێجار لە شێوەی دەرکەوتنی ئاستێکی دیار لە جیاوازی نێوان پێکهاتەکاندا زەق دەبێتەوە، لەڕاستیدا لە سەرجەم کۆمەڵگەکانی

جیهان و لەنێو پارتە سیاسیەکاندا جیاوازی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا بەدی دەکرێت، بەڵام لە هەندێك لە پارتە سیاسیەکاندا نابێتەهۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی. بەتایبەت لە پارتە سیاسیەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو. کە تیایدا هەموو پێکهاتەکانی ئەو پارتە بە جیاوازی سەرمایە و بیرکردنەوە و ئاستی کۆمەڵایەتیانەوە ئازادن لە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیان، بەڵام بەپێچەوانەوە لە بەشێکی دیار لە پارتە سیاسیەکانی وولاتە دواکەوتووەکاندا جیاوازی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا هۆکارێکی سەرەکیە بۆ سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی. ئەم جیاوازییەش خۆی دەبینێتەوە لە ئاستی سەرمایە و ئینتیماکردن بۆ خێڵ و هۆزێکی دیاریکراو، یان بۆ کەسایەتی و بنەماڵەیەکی دیاریکراو، کە تیایدا تاکەکان لەڕێی شانازیکردنێکی توندڕەوانە بە پێگە کۆمەڵایەتیەکانیان دەکەونە ڕەتکردنەوەی پێگەی کۆمەڵایەتی ئەوانی دیکە، لە دەرەنجامیشدا پێکدادان و ململانێیەك لە ناوخۆی پارتی سیاسیدا دروست دەبێت کە ڕەنگە کاتێکی زۆر و بوارێکی فراوانی ئەو پارتە بۆ خۆی داگیر بکات، بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە زۆرجار پەنابردن بۆ شانازیکردن بە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوەوە ڕۆڵی تاکەکان وەلادەنێت و لە تواناکانیان کەم دەکاتەوە، ئەمەش بە هیچ جۆرێك لە بەرژەوەندی خودی تاك خۆیدا نیە، چونکە هەر کاتێك پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێزتر هاتەکایەوە، ئەوا ئەوانی دیکە پشتگوێ دەخات و ئەمەش بەردەوامییەك دەداتە ململانێی ناوخۆی پارتی سیاسی.

٢. جیاوازی ئاینی و مەزهەبی:

جیاوازی ئاینی و مەزهەبی بە یەکێك لە سەرەکیترین هۆکاری سەرهەڵدانی ململانێکانی جیهان دادەنرێت، بەشێوەیەك کە بوەتە ململانێیەکی ئەزەلی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کۆمەڵگەکانی ڕووپۆش کردووە بە ململانێیەك کە هەندێجار کارەساتی خوێناوی و ترسناکی لێکەوتۆتەوە، نمونەی ئەم حاڵەتە لەمێژوودا گەلێك زۆرە وەك ململانێی نێوان (شیعە و سوننە، کاسۆلیك و پرۆتستانت، جولەکە و مەسیح، جولەکە و ئیسلام،...هتد).

جیاوازی ئاینی و مەزهەبی یەکێکی دیکەیە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی پارتە سیاسیەکان کە بریتیە لە هەبوونی جیاوازی ئاینی و مەزهەبی لە نێوان ئەندامانی ئەو پارتە سیاسیەدا. ئەم جۆرە هۆکارە زیاتر لەو پارتانەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە خاوەنی تێڕوانینێکی ئایینیانە بۆ پرۆسەی سیاسی کە دەکرێت پێیان بڵێن (پارتە ئایینیەکان)، بەجۆرێك ئەم پارتانە ڕێگە بە بوونی جیاوازی ئاینی و تەنانەت جیاوازی مەزهەبیش نادەن لەنێو پارتەکەدا، بەڵام ئەوەی لێرەد گرنگە ئەوەیە لەنێو ئەم پارتە سیاسیانەشدا تاکەکان -کە سەر بە یەك ئاین و مەزهەبێکن- پۆلێن دەکرێن بۆ (پابەند-مولتەزم) و (ناپابەند-ناموڵتەزم)، هەر بەپێی ئەم پۆلێنکردنەش پلە و پێگەی ئەندامان لەناو ئەو پارتە سیاسیەدا دیاری دەکرێت، بەڵام لێرەدا ڕوون نیە کە ئایا کێ هەڵدەستێت بە دیاریکردنی کەسانی (پابەند) و کەسانی (ناپابەند)؟ هەروەها ئەو پێوەرە سەرەکیانە کامانەن -جگە لە پێوەری ئاینی- کە تاکەکانی بەسەر (پابەند) و (ناپابەند) پێ دابەش دەکرێت؟

ئەم جۆرە جیاوازییەی نێوان ئەندامانی کۆمەڵگە یان ئەندامانی پارتێکی سیاسی ترسناکترین جۆری جیاوازییە کە لەئەنجامیدا ململانێییەکی لێدەکەوێتەوە کە دەشێت سەرەتای هەبێت، بەڵام دیاریکردنی کۆتاییەکەی زۆر ئەستەمە.

٤. جیاوازی عەقڵیەت و ڕۆشنبیری:

جیاوازی عەقڵیەت و جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری یان بیرکردنەوەی ئەندامانی پارتێکی سیاسی کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە لە دروستکردنی ململانێی ناوخۆیی لەنێو ئەو پارتە سیاسییەدا، هەروەك زۆرجار دەبینین ئەندامی پارتێکی سیاسی لە ئاستێکی بەرزی بڕیارداندایە، بەڵام خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی بەهێز نیە کە بتوانێت بڕیارەکان بەشێوەیەکی زانستیانە وەربگرێت، لەئەنجامدا کەسێك کە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی بەهێز و عەقڵیەتێکی فراوانە، بەڵام لە مەرکەزی بڕیارداندا نیە دەکەوێتە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ ئەو کەسەی کە ڕۆشنبیری نیە و لە مەرکەزی بڕیارداندایە، زۆرجار دەگونجێت ئەو تاکەکەسە کەسانی دیکە لە چواردەوری خۆی کۆبکاتەوە و تەکەتولات دروست بێت.

لەڕاستیدا چەمکی ڕۆشنبیر چەمکێکی سادە نیە و دیاریکردنی کەسی ڕۆشنبیر لەناو کۆمەڵگە و پارتە سیاسیەکاندا کارێکی ئاسان نیە، چونکە لە بنەڕەتدا پێوەرەکانی دیاریکردنی ڕۆشنبیر لە ژینگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕدرێت. بیرمەندانیش بۆچوونی جیاوازییان لەم بارەیەوە دەربڕیوە، بۆنموونە (عەلی حەرب) دەڵێ:

(ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە سەرقاڵی ماف و ئازادییەکانە و بە فکر و گفتوگۆ و نووسین هەڵوێستەکانی داکۆکی لە سیاسەتی ڕاستی و بەهە ڕۆشنبیرییە کۆمەلأیەتی و گەردوونیەکانی دەکات)، بەلأم لای (ئەنتۆنیۆ گرامشی) ڕۆشنبیر دوو جۆرە: یەکەمیان ڕۆشنبیری کلاسیکی Traditional Intellectual، وەك مامۆستا و قەشە و بەڕێوەبەران، دووەمیشان ڕۆشنبیری ئۆرگانیك Organic Intellectual، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ چین و ڕێکخراوەکاندا هەیە، بەلأم بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە کار بۆ بەدیهێنانی خواست و ئامانجەکانی خەڵك دەکات بەشێوەیەکی تیۆری، بەلأم بوارە پراکتیکیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی دەزگا ڕاپەڕێنەرەکانی کاروباری دەوڵەت.

لەڕێی ئەم بەشە تیۆرییەی چەمکی ڕۆشنبیرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دیاریکردنی کەسی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگەکاندا کارێکی ئاسان نیە، بە هەمان شێوەش لەناو پارتە سیاسیەکاندا دیاریکردنی ئاستی عەقڵیەت و بیرکردنەوەی دروست و ڕاددەی ڕۆشنبیری کارێکی ئاسان نیە و ئەمەش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو ململانێیەوە هەیە کە لەناو پارتە سیاسیەکاندا هەیە، چونکە پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی کەسی ڕۆشنبیر و فەلسەفەی ڕۆشنبیری لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دی و لە پارتێکی سیاسیەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت، لە دەرەنجامیشدا دوورنیە هەندێجار ئەم هۆکارە ببێتە هۆکارێکی بێ بنەما، بەوپێیەی دیار نیە کێ ڕۆشنبیرە و کێ خاوەنی هێزی بڕیاردەری ئەو حاڵەتەیە، بەلأم لە بەشێکی زۆر لە پارتە

سیاسیەکاندا ئەم بابەتە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئاستی بیرکردنەوەی ئەندامانی پارتە سیاسیەکانەوە هەیە.

٥. جیاوازی بەرژەوەندی:

لەبەرئەوەی ئامانجی سەرەکی گشت بوارەکانی ژیانی مرۆڤ بریتیەلە بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان هەربۆیە تاکەکانی کۆمەڵگە مافی خۆیانە کار بۆ پاراستن و فراوانبوونی مەودای ئەو بەرژەوەندییانە بکەن، بەتایبەتی کە سروشتی مرۆڤ بەردەوام لە هەوڵی بەدەستهێنانی زیاترە لەوەی کە هەیەتی. لەم بوارەشدا کێشەی سەرەکی مرۆڤەکان ئەوەیە کە خواستەکانیان (طموح) ببێتە چاوتێبڕین (طمع)، واتە کاتێك بەرژەوەندی مرۆڤێك بەدی بێت کە بەرژەوەندی کەسێکیتر یان کۆمەڵێکیتر لەناوبچێت، ئەمەش پێچەوانەی بەها مرۆییەکانە.

لەناو پارتە سیاسیەکاندا بەرژەوەندییەکان هۆی سەرەکی دروستبوونی ململانێی ناوخۆیین، بەتایبەت وازنەهێنان و بەجێنەهێشتنی کورسی دەسەڵات لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو پاتەوە دەبێتەهۆی دروستبوونی ململانێیەکی بەهێز لەنێوان ئەو ئەندامانەی کە لە هەوڵی ئەوەدان ببنە بەشێك لە هێزی بڕیاردەری ئەو پارتە سیاسیە، هەربۆیە هەر کاتێك ئەندامانی هۆشیاری پارتێکی سیاسی هەستیان کرد هێزێکی دەستەڵاتدار یان کەسانێکیتر لەناو پارتەکەیاندا بەرژەوەندییە گشتیەکانیان دەخاتە مەترسییەوە، ئەوا ڕووبەڕووی دەوەستنەوە و دەکەونە ململانێیەکی بەهێزەوە لەگەڵیدا، بەلام کێشەی سەرەکی لەم حاڵەتەدا ئەوەیە کە لە زۆربەی کاتدا هەوڵدان بۆ زاڵکردنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی

لەنێو پارتێکی سیاسیدا، لە نموونەی ئەم حاڵەتە لە زۆربەی وڵاتانی دواکەوتوو بەدی دەکرێت، بەتایبەت کاتێك کادری سەرەکی کادر و ئەندامانیان بۆتە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتەکان و پارتی سیاسیش هیچ نیە جگە لە چوارچێوە و دەروازەیەك بۆ گەیشتن بەو بەرژەوەندییانە، ئەمەش پێچەوانەی ئەو خاڵە سەرەکیەیە کە لە پێناسەی پارتی سیاسیدا هاتووە کە ئەو کەسانەی لە پارتێکی سیاسیدا کۆدەبنەوە دەبێت خاوەنی ئامانجێکی گشتی و هاوبەش بن و کار بۆ بەدیهاتنی زۆرترین رێژەی ئەو ئامانجانە بکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە هەوڵی هەر تاکێکیش بۆ بەدیهاتنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی لەسەر حسابی ئەوانی دی دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆیی لە پارتی سیاسیدا.

- **چارەسەری ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسیەکان:**

لەبەرئەوەی هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسیەکان بریتیە لە بوونی جیاوازی لەنێوان ئەندامانی حزبدا، لەم بارەیەشەوە بیرمەندان (جیمس وێبر) و (لویس بارنیس) پێیان وایە (هەموو مملانێکان کاتێك سەرهەڵدەدەن کە جیاوازییەکان سەرکوت بکرێن و هەتا رێژەی ئەو سەرکوتکردنەش زیاتر بێت ئاراستە و مەودای ململانێ توندتر دەبێت)، هەربۆیە هەوڵدان بۆ ئیدارەکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ جیاوازییەکان دەبێتە سەرەتای چارەسەرکردنی ململانێکان، بەشێوەیەکی گشتیش ئەم چارەسەرە بە چەند هەنگاوێکدا تێپەردەبێت و ئەو هەنگاوانەش بەشێوەی پلەبەندی بەڕێوەدەچن، لێرەدا گرنگترین ئەو قۆناغانە دیاری دەکەین:

**قۆناغی یەکەم: دیاریکردنی خودی ململانێ:**

یەکەمین هەنگاوی چارەسەری ململانێ بریتیەلە ناسینی خودی ململانێکە، ئەمەش لەرێی دیاریکردنی ئاست و بوار و ڕاددەی ململانێ و گرنگترین ئەو لایەنانەی پەیوەندی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان هەیە بە ململانێکەوە ئەرکێکی سەرەکی لە دیاریکردنی خودی ململانێدا بریتیە لە زانینی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو ململانێیە و فراوانبوونی چونکە ناتوانرێت رەهەندە سەرەکیەکانی ململانێ دەستنیشان بکرێت بەبێ زانینی هۆکارەکانی دروستبوونی، لێرەشدا کاتێك لەناو پارتێکی سیاسیدا و لە قۆناغی یەکەمدا هۆکار و بناغەی ململانێ ناوخۆییەکان ئاشکرابوون، ئەوکاتە دەتوانرێت ئاستی چارەسەر گونجاوەکان بۆ ئەو ململانێیە بدۆزرێتەوە، هەمیشە ئەو حاڵەتەش لە چارەسەرێکی کێشەکاندا پەیڕەو دەکرێت، هەروەکو بەشێك لە لێکۆڵەرانی بواری زانستە مرۆییەکان پێیان وایە کە زانینی کێشەکان واتە نیوەی چارەسەری خودی کێشەکە، بۆ پارتە سیاسیەکانیش زانینی کێشەکان و دیاریکردنی هۆکارەکانی دروستبوونیان هەنگاوێکی سەرەکییە بۆ کۆتاییهێنان بە ململانێ یان لانی کەم کەمکردنەوەی.

**قۆناغی دووەم: دیاریکردنی ئامانجەکان:**

هەموو پارتێکی سیاسی خاوەنی کۆمەڵێك ئامانجە کە بەشێوەی نوسراو و نەنوسراو لە یاسا و سیاسەتەکانی ئەو پارتەدا دیاری دەکرێن و سەرجەم هەوڵی ئەندامان و لایەنگرانی پارتە سیاسیەکان لەپێناو بەدیهاتنی ئەو ئامانجانەدایە، لێرەشدا ئەگەر بۆچونی جیاواز

سەرهەڵبدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان لە هەندێ کاتدا دەکرێ دیاردەیەکی ئاسایی تەماشا بکرێت، بەڵام ئەگەر جیاوازی لە ئامانجەکاندا سەری هەڵدا ئەوا ململانێکان چەکەرە دەکەن، بۆ چارەسەرکردنی ئەم ململانێیانە لە قۆناغی دووەم و دوای دیاریکردنی خودی ململانێکە، دەبێت ئامانج لە چارەسەرکردنی ململانێکان دیاری بکرێت و دەبێت ئەو ئامانجانەش تارادەیەکی فراوان یەکانگیربن لەگەڵ ئاراستەی ئامانجە گشتیەکانی پارتە سیاسیەکەدا، لەڕاستیشدا ئامانجی چارەسەری ململانێکان بریتیە لە هاوسەنگییەکی بەرجەستەبووی نێوان ئامانجی گروپەکانی ململانێ، واتە دۆزینەوەی هێڵێکی هاوبەش و ناوەند لە نێوان ئەو لایەنانەی ململانێکانیان دروست کردووە.

### قۆناغی سێیەم: ڕێگرتن لە کەڵەکەبوونی ململانێ:

لە قۆناغی سێیەم و پاش دیاریکردنی ململانێ و ئامانج لە چارەسەرکردنی، قۆناغی سێیەمیش وەك قۆناغێکی سەرەتایی لە چارەسەرکردن بریتیە لە ڕێگرتن لە هەر کەڵەکەبوون و قوڵبوونەوەیەکی زیاتری ئەو ململانێیە، لێرەوە ئەوە بەدی دەکرێت کە چانسی چارەسەرکردن و بنبڕکردنی ململانێ لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانیدا زیاترە تا پاش کەڵەکەبوونی، چونکە لەگەڵ بەردەوامبوونیدا ململانێکان قوڵ دەبنەوە و ئەرکی ئەو لایەنانە قورستر دەبێت کە دەیانەوێت ململانێی ناوخۆی ئەو پارتە سیاسیە چارەسەر بکەن.

**قۆناغی چوارەم: دیاریکردنی ئەلتەرناتیڤی گونجاو:**

بەهۆی پێشکەوتنەکانی جیهانەوە لە سەرجەم بوارەکاندا چەندین ئەلتەرناتیڤ لەبەردەم کەسایەتی و لایەنەکاندا هەیە بۆ بڕیاردان لەسەر چارەسەری کێشەکان. بۆ چارەسەرکردنی هەموو ململانێکان پێویستە چەند ئەلتەرناتیڤێك لەبەردەست لایەنە چارەسەرکارەکاندا هەبێت، هەمیشە بوونی فرەیی لە ئەلتەرناتیڤەکاندا ئاراستەکانی کارکردنی چارەسەرخوازی فراوانتر دەکات. بەجۆرێك کاتێك ئەو لایەنانە هەنگاو بۆ چارەسەری ململانێ دەنێن لەنێو ئەو چەندین ئەلتەرناتیڤەدا هەڵدەستن بە دەستنیشانکردنی باشترین و گونجاوترین ئەلتەرناتیڤ بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کێشەیەدا و پاشان لەڕێی ئەو ئەلتەرناتیڤەوە کە هەڵیدەبژێرن چارەسەری ئەو کێشەیە دەکەن.

بەشێوەیەکی گشتی بوونی ململانێ لە ناوخۆی پارتە سیاسیەکاندا حاڵەتێکە لە سەرەتای دروستبوونی پارتە سیاسیەکانەوە هەبووە و لە هەندێجاریشدا وەك حاڵەتێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، ململانێی ناوخۆی پارتە سیاسیەکان یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئاستەنگ و ڕێگرییانەی ڕووبەڕووی پارتە سیاسیەکان دەبێتەوە و لە هەندێکجاریشدا دەرەنجامی ترسناك لەسەر بنەما و پرەنسیپ و ئەرکی پارتە سیاسیەکان بەجێدەهێڵێت، کە دەبێتەهۆی دابەشبوونی بۆچوونەکان و دووریش نیە ببێتەهۆی دابەشبوونی پارتی سیاسی، بەڵام ناتوانرێ بە بەهێزی یان لاوازی دیموکراسی لە ناوخۆی پارتەکاندا بوون یان نەبوونی ململانێ دیاری بکرێت، چونکە جاری وا هەیە لە نەبوونی دیموکراسیدا ناڕەزایی سەرهەڵدەدات و لە بوونی دیموکراسیدا جیاوازییەکان قوڵدەبنەوە، لە دەرەنجامیشدا هەموو

**ململانێکـان بـه جیـاوازی هۆکارەکـانی ســەرهەڵدانیانەوه قـابیلی چارەسەرکردنن.**

بیرمەند (بلۆندال) پارتی سیاسی دابەش دەکات بۆ چوار جۆر، کە بریتین لە:

١. پارتی تیرەگەری (طائفی).
٢. پارتی نەژادی (عرقی).
٣. پارتی ئاینی (دینی).
٤. پارتی چینایەتی (طبقات).

لەلایەکیترەوە (مارسیل برلو) پێی وایە پێنج جۆر پارتی سیاسی هەیە، ئەوانیش:

١. پارتی ئایدیۆلۆژی (عقائدی).
٢. پارتی کەسایەتی (شخصیات).
٣. پارتی مێژوویی (تاریخی).
٤. پارتی ئاراستەیی (اتجاه).
٥. پارتی بەرژەوەندی (مصالح).

بەڵام بیرمەندی بەناوبانگی بواری لێکۆڵینەوەی پارتە سیاسیەکان (موریس دوڤرجێ)، پارتی سیاسی دابەش دەکات بۆ چوار جۆر، کە بریتین لە:

١. پارتی پارێزگاران (موحافزکار).
٢. پارتی سۆشیالستی.
٣. پارتی کۆمۆنیستی.

٤. پارتی فاشی. (پێویسته ئەوه بوترێت کاتێك دۆڤرجیێ باسی لە پارتی فاشی کردوه، فاشیزم هەرەمی بالأی دەسەلأتدا بووه لە زور ولأت دا).

بەوپێیـەی کـە زانـا (مـوریس دوڤرجـیێ) بـە کاریگـەرترین و بەبەرهەمترین زانای بواری پارتی سیاسی دادەنرێت، هەربۆیە بەپێی پۆلێنکردنـەکانی نـاوبراو بـاس لـە پـارتی سیاسـی دەکـەین. ئەمـە سـەرەرای ئـەوەی لـە خـاڵێکی سـەربەخۆدا باس لـە پارتـە سۆشـیال دیموکراتـەکان دەکـەین کـە (مـۆریس دۆڤرجـیێ) لـە دابەشـکردنەکانیدا ئاماژەی پێنەداوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

**یەکەم: پارتە سیاسییە محافزکارەکان:**

لە ئێستادا بۆ ئەم جۆرە پارتە دوو نمونەی سەرەکیمان هەیە، کە بریتین لە:

**١. پارتە سیاسییە محافزکارەکانی بەریتانیا:**

ئەو پارتە تەقلیدیانەن کە لە ئەوروپا لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سـەدەی بیـستدا هـەبوون، بـەریتانیا لـە سـەدەی حەڤـدە کێبڕکێیـەکی گـەورەی بـەخۆوەبینی لـە نێـوان هـەردوو گروپـی (تـۆریز Tories) و گروپـی (ویکـز Whiqs)، کـە دواتـر بەشێوەی کێبـەرکێی نێـوان پـارتی موحافزکـار و پـارتی ئـازادیخوازان (الاحـرار) بەدیارکـەوت، گروپـی (تـۆرێز) وەك پـارتێکی محافزکـار پاڵپـشتێکی سـەرەکی فراوانبـوونی دەسەلأت و ئیمتیازاتی مەلیك بون، بەلأم گروپی (ویکز) وەك پـارتێکی

ئـازادیخواز دژی فراوانبـوونی ئـەم دەســەڵاتە بـوو، ئـەم کێبەرکێیــە بـەردەوام بـوو تـا سـەرەتای سـەدەی بیـستەم و دروسـتبوونی پـارتی کرێکارانی بەریتانیا لە ساڵی (١٩٠٠)، کاتێك پارتی کرێکاران توانی ببێتە هێزێکی سەرەکی کێبەرکێ سیاسیەکان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی بەریتانیا و چەندین جار گەیشتنە دەسەڵات، لە ئەنجامدا جەماوەری پارتی ئازادیخواز کەمی کرد و کێبەڕکێ لەنێوان موحافزکار و پارتی کرێکاراندا سەری هەڵدا.

**گرنگترین تایبە تمەندییەکانی پارتی موحافزکاری بەریتانیا بریتیەلە:**

١. گرنگییەکی لەرادەبەدەر ئەدەن بە دەستەبژێر (النخبە).

٢. بودجەیان لەسەر ئەو برە بەخشینەیە کە ئەندامە دەوڵەمەندەکان پێشکەشی دەکەن.

٣. چالاکیەکانیان بەردەوام نیە و پەیوەستە بە حاڵەتە سیاسیەکان و هەڵبژاردنەکان.

٤. بەرژەوەنـدی ئەندامـەکانی کۆدەکاتـەوە نـەك ئایـدۆلۆژیا، چـونکە ئەم جۆرە لە پارت دوورن لە ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراوەوە.

**٢. پارتە سیاسیە ئەمریکییەکان:**

مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چەندین پارتی سیاسی بـەخۆوەبینیوە لەوانـە پـارتی (الاتحـادین) بەرابەرایـەتی (هـاملتون) و (ادم)، هەروەها پارتە کۆمارییەکان بە ڕابەرایەتی (مادسۆن).

لەنێوان ساڵانی ١٧٩٠- ١٧٩٩ کۆمەڵێك پارتی سیاسی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەریهەڵدا، بەڵام ئەم پارتە سیاسیانە لەسەر بناغەی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو دروست نەبوون، بەڵکو بەرژەوەندی سیاسی پاڵنەری سەرەکی دروستبوونیان بوو، ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ رێگرتن لە سەرهەڵدانی پارتی سۆشیالیستی لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لەئێستادا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوو پارتی سەرەکی هەن ئەوانیش پارتی کۆماری و پارتی دیموکراتیە، ئەم دوو پارتە لەسەر بناغەیەکی ئایدیۆلۆژی کارناکەن و گرنگییەکی تەواو ئەدەن بە دەستەبژێری کۆمەڵگە، هەریەك لەم دوو پارتە نامەرکەزین و هەر ئۆرگانێك بەپێی (شار، ویلایەت) سەربەخۆیی خۆی هەیە لە کارکردن و بریارداندا، پارتی کۆماری هەوڵدەدات سەرمایەداران لە پارتەکەی نزیك بکاتەوە، بەڵام پارتی دیموکراتی لەپاڵ هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوەی چینی سەرمایەدار هەوڵدەدات هەژارانیش لەخۆبگرێت.

دووەم: پارتە سۆشیالیستەکان:

لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پارتە سۆشیالیستییەکان:

١- گرنگی تەواو دەدات بە کرێکاران، بەوپێیەی هەژارترین چینە و زۆرترین ژمارەی خەڵك لەخۆدەگرێت.

٢- ئایدیۆلۆژیا لەم پارتانەدا رۆڵێکی سەرەکی هەیە.

٣- چالاکیەکانی کار لەسەر پێگەیاندنی جەماوەر دەکات.

٤- بودجەی سەرەکیان لەرێی ئابوونەی ئەندامەکانیەوەیەتی.

**سێیەم: پارتە کۆمۆنیستییەکان:**

**لەم بوارەدا دوو نموونەی سەرەکی هەن:**

1- پارتی کۆمۆنیستی چینی.

2- پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت.

مەبەست لە پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت ئەو پارتەیە کە لە ساڵی ١٨٩٨ لە روسیا دامەزراوە و لە دوو باڵی سەرەکی (بەلشەفیک- زۆرینە. مەنشەفیک-کەمینە) پێکهات، پاشان لە ساڵی ١٩٠٣ لە لەندەن کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بەسترا و لەم کۆنگرەیەدا بە تەواوی جیاوازی نێوان ئەو دوو باڵە دەرکەوت لەسەر شێوازی ئەندامێتی لەو پارتەدا، بەشێوەیەك جیاوازیەکی گەورە لەنێوان (لینین و بلیخانوف) لەلایەك و (مارتۆف و ترۆتسکی) لەلایەکیتر سەریهەڵدا.

(لینین) پێی وابوو دەبێت ئەندامێتی لەو پارتەدا تەنها بۆ ئەو کەسانە بێت کە توانای شۆڕشیان هەبێت، بەڵام (ترۆتسکی) پێی وابوو هەر کەسێك لایەنگری ئەو شۆڕشە بکات دەبێت ڕێگەی پێ بدرێت ببێتە ئەندام. بەم شێوەیە لە ساڵی ١٩٠٣ بەدواوە پارتی کۆمۆنیستی دوو باڵی سەرەکی بەلشەفیك و مەنشەفیك کاریان تێدا دەکرد، بەڵام هیچ کام لەم دوو باڵە ئامادە نەبوون ئەو پارتە دابەش بکەن بۆ دوو پارت.

پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی لەڕووی ڕێکخستنەوە لە شانە پێکهاتووە کە داهێنراوی خۆیەتی و لە سێیەمین کۆنگرەی جیهانی هەموو پارتە کۆمۆنیستەکانی جیهاندا، کە لە ٢١ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤دا لە شاری مۆسکۆ بەڕێوەچوو، پەسەند کرا. لە ڕووی

داراییشەوە ئابوونەی ئەندامان و داهاتی پەیمانگاکانی پێگەیاندنی پارت سەرچاوەی دارایی بوون.

چوارەم: پارتی فاشی:

مەبەست لە فاشیەت ئەو سیستەمەیە کە مۆسۆلینی دایهێناوە و بەردەوام بووە تا ساڵی ١٩٤٥ پاش لە سێدارەدانی مۆسۆلینی، فاشیەت بە بۆچوونەکانی (نیتشە، سورێل، بارینۆ) کاریگەر بووە و مەبەست لێی فەلسەفەیەکی ناعەقڵانییە و هێرش دەکاتە سەر عەقڵ و پێیوایە خوێن و رەگەز و دابونەریت و خێزان هۆکاری سەرەکین لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. ئەم فەلسەفەیە بڕوای بە یەکسانی مرۆڤەکان نیە و پێیوایە هەندێك شیاوی دەسەڵاتن و هەندێکی دیکەش تەنها دەبێت ملکەچ بن.

لێرەوە دوو نمونەی پارتی فاشی وەردەگرین:

١. پارتی فاشی ئیتالی:

لە ساڵی ١٩١٤ لەلایەن مۆسۆلینی لە ئیتاڵیا دامەزراوە، لە ساڵی ١٩٢٢ گەیشتە دەسەڵات و سەرجەم پارتە سیاسییەکانی رەتکردەوە و سیستەمێکی دیکتاتۆرییانەی تاك حزبی هێنایەکایەوە. فاشیەت گرنگی تایبەتی دەدات بە دەوڵەت، لەم بارەیەوە مۆسۆلینی دەڵێت: (ئەگەر لیبڕاڵیەت مانای تاك بگەیەنێت ئەوا فاشیەت واتە دەوڵەت)، یان دەڵێت: (هەموو شتێك واتە دەوڵەت هیچ شتێکیتر لە دەرەوەی دەوڵەتدا نیە). پارتی فاشی ئیتالی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەسەرەتادا دژی

بەشداریکردنی ئیتاڵیا بوو شانبەشانی هاوپەیمانان، بەڵام دواتر لە تشرینی یەکەمی ١٩١٤ مۆسۆلینی بەناوی ئەو پارتەوە ڕەزامەندی نیشاندا بۆ بەشداریکردنی ئیتاڵیا لەو جەنگەدا.

٢. پارتی نازی ئەڵمانیا:

لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر دەستی (ئەدۆلف هیتلەر) دامەزرێنرا و لە هەڵبژاردنی گشتی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٢٨ دوانزە کورسی پەرلەمانی بەدەستهێنا. بەڵام لە تەمموزی ساڵی ١٩٣٢ توانی نزیکەی (١٣٧٥٠٠٠٠) سیانزە ملیۆن و حەوت سەد و پەنجا هەزار دەنگ بەدەستبهێنێت کە کردیە ٢٣٠ کورسی لە پەرلەمانی ئەڵمانیا، پاشان لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵ ڕێژەی دەنگەکانی دابەزی بۆ (١١٧٥٠٠٠٠) یانزە ملیۆن و حەوت سەد و پەنجا هەزار دەنگ کە کردیە ١٩٦ کورسی پەرلەمان. لەئەنجامدا لە شوباتی ساڵی ١٩٣٣ (ئەدۆلف هیتلەر) بوە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا و دواتر هەڵبژاردنێکی گشتی ئەنجامدرا و پارتی نازی نزیکەی (١٧٢٥٠٠٠٠) حەڤدە ملیۆن و دوو سەد و پەنجا هەزار دەنگی بەدەستهێنا بەمەش زۆرینەی ڕەهای کورسییەکانی پەرلەمانی مسۆگەر کرد و لە هەڵوێستێکی بێوێنەدا بە بڕیارێکی پەرلەمان کۆمۆنیستەکانی لە پەرلەمانی ئەڵمانیا دەرکرد.

**گرنگترین خاڵەکانی لەیەکچوون لا نێوان پارتی ڤاشی ئیتاڵی و پارتی نازی ئەڵمانی:**

أ. دوو بزوتنەوەی سیاسی بوون کە لەناو چینی ناوەڕاستدا سەریانهەڵدا.

ب. شێوازی وروژاندنی سۆز و هەستی نەتەوەیی رەگەزپەرستانەیان بەکاردەهێنا.

ت. هەردوو پارتەکە بڕوایان بە دەستەبژێر هەبوو.

پ. شێوازی توندوتیژییان بۆ لەناوبردنی دوژمنەکانیان بەکاردەهێنا و دەزگای پۆلیسی جۆراوجۆریان هەبوو، وەکو (تیمی پۆشاك رەش) لە ئیتاڵیا و تیمی(SS) لە ئەڵمانیا.

ج. کەسایەتی سەرکردە پیرۆز رادەگیرا.

ح. هەردوو پارتەکە رۆڵی تاکیان وەلادەنا، پارتی فاشی ئیتاڵیا دەوڵەت بە پیرۆز دەزانێت، بەڵام پارتی نازی ئەڵمانیا گەل بە پیرۆز دەزانێت.

لە ڕوانگەی کەسایەتی سەرکردەوە لە نازیەتدا وتەیەکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێت: (تۆ هیچ نیت گەلەکەت هەموو شتێکە).

**جیاوازی نێوان پارتی کۆمۆنیستی و پارتی فاشی:**

١. پارتی کۆمۆنیستی لەسەر بناغەی دیکتاتۆرییەتی چینی کرێکار دروست دەبێت، بەڵام پارتی فاشی لەسەر بناغەی بەرژەوەندی چینی ناوەڕاست دروست دەبێت.

٢.	فەلسەفەی پارتی کۆمۆنیستی هەڵگری تێڕوانینێکی گەشبینە و بڕوای بە پێشکەوتنی کۆمەڵگە هەیە، بەڵام فەلسفەی فاشیەت فەلسەفەیەکی ڕەشبینە و هەمیشە بیر لە سەروەرییەکانی ڕابردوو دەکاتەوە.

٣.	فەلسەفەی پارتی کۆمۆنیستی بڕوای بە بڵاوبوونەوەی فکری مارکسیەت هەیە. بەلام فاشیەت بۆچونێکی نەتەوەیی ڕەگەزپەرستیە.

٤	پارتی کۆمۆنیستی بڕوای بە جەماوەر هەیە، بەڵام پارتی فاشست بڕوای بە دەستەبژێر هەیە.

**پێنجەم: پارتە سیاسییە سۆشیال دیموکراتەکان:**

هزری سۆشیال دیموکراتی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا پەیدابوو- واتە ئەو کاتەی (ئیدوارد بێرنشتاین)ی بیرمەندی مارکسیزمی ئەڵمانی دیدگا و بۆچوونی خۆی لەبارەی سۆشیالیزمەوە دەربڕی. (بێرنشتاین) رایگەیاند کە پێشبینی (کارڵ مارکس) دەربارەی لەناوچوونی سەرمایەداری و سەرکەوتنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکار، پێشبینی و دیدگای نادروستن. نوێکردنەوەی تێڕوانینەکانی مارکسیزمیش لەو سەردەمەدا بوەهۆی سەرهەڵدانی ڕێبازێك کە ئەوکاتە پێیان دەوت ڕێبازی (نوێخوازی) لەناو بزاڤی سۆشیالیستی و مارکسیدا. ئەم ڕێبازە گرنگی زیاتری دەدا بە ئامانجەکانی سۆشیالیزم لە ڕێگەی پەرلەمان و ڕەوشی چاکسازی و ریفۆرمی بەردەوام، نەوەك ئامانجی کۆتایی شۆڕش و سەرکەوتنی چینی کرێکاران. ئەمە سەرەڕای گرنگیدان بە یەکێك لە هەرە گرنگترین بنەماکانی سۆشیال دیموکراتی کە بریتیەلە (پرەنسیپی گۆڕانکاری

سیاسی هاوشێوە) کە دەبێتە وێستگەیەک و سۆشیال دیموکراتی دەخاتە نێوان هەردوو بزاڤی سۆشیالیزم و لیبرالیزم.

لە بەریتانیا و لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ڕێگای بزووتنەوەی (فابیانی)ی ڕۆفۆرمیستەوە نەریتی نوێخوازی بزاڤی سۆشیالیستی وەکو بەشێک لە سۆشیال دیموکراتی سەریهەڵدا. کەسانی ناوداری وەک (پیاترێس، سێدنی وێب، گراهام والآس، جۆرج بێرناردشۆ، هێربێرت جۆرج وێلز،....هتد) ڕابەرایەتی ئەم بزوتنەوەیەیان دەکرد و توانیان تا ساڵی ١٩٥٦ و بڵاوبوونەوەی کتێبی (ئایندەی سۆشیالیزم)ی (ئا.ر.کراسلند) ئەم بزوتنەوەیە پەرەپێ بدەن.

سۆشیال دیموکرات هەوڵێکە بۆ بەدیهێنانی سیاسەتی یەکسانخوازی و بڕوای بە دەوڵەتی خۆشگوزەران هەیە، بەجۆرێک یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی دەوڵەت بریتیەلە سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سامان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەنێو هاووڵاتیاندا.

جیاوازی نێوان سۆشیال دیموکرات و هەردوو ڕێبازی لیبرالیزمی و سۆشیالیستی مارکسی ئەوەیە کە پەیڕەوانی لیبراڵیزم خاوەن دیدگا و تێڕوانینی خۆیانن کە مافەکانی تاک لە بەرامبەر دەوڵەتی خۆشگوزەراندا دەخەنەڕوو. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ڕەخنە لە شێوەی دابەشکردنی سامان دەگرن لەلایەن دەوڵەتەوە. هەروەها سۆشیال دیموکراتەکان داکۆکی دەکەن لە چەمکەکانی بەرپرسیاریێتی کۆمەڵایەتی و ئەرکی دەوڵەت لە هاوکاریکردنی ئەو تاک و کەسانەی کە

خاوەنی ئیمتیازی کەمترن. بەبڕوای سۆشیال دیموکراتەکان ئەم بەرپرسیارێتیە کۆمەڵایەتییە دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت.

لەلایەکی دیکەوە مارکسییەکان بڕوایان وایە کە دەبێت سەرمایەداری لەناوبچێت، بەڵام سۆشیال دیموکراتەکان لە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو ئاڵۆزییانەن کە لە ئەنجامی پەیرەوکردنی بازاڕی ئازادەوە پەیدا دەبێت بەشێوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ ریفۆرمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان.

مارکسیزم دەیەوێت پرسی دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی ئابورییەوە چارەسەر بکات، واتە دەیەوێت دیدگای ئەخلاقی ڕزگارکردنی چینە کۆمەڵایەتییەکان وەکو پێشڕەوی ئابووری عەقڵانی پاش سەرمایەداری بخاتەڕوو. بەڵام سۆشیال دیموکرات هەوڵدەدات کە ئابووری سیاسی دووبارە پەردەپۆش بکات بە ڕەهەندە ئەخلاقییەکان و لە سەرەنجامدا دەیەوێت پرسی دادوەری کۆمەڵایەتی وەکو یەکێك لە پرسە ئەخلاقییەکان بناسێنێت، نەك وەك کێشەیەکی ئابووری.

سەرەڕای ئەم لایەنە ئیجابییانە، بەڵام کۆمەڵێك ڕەخنە ئاراستەی سۆشیال دیموکراتەکان دەکرێت کە ئەوان خاوەنی بیروڕایەکی هاوبەش نین و لەم زەمینەیەدا ئاستەنگیان هەیە و تەنها نادڵسۆزی ئەوان بەرامبەر ئامانجی کۆمەڵایەتی سۆشیالیزم و ئامانجەکانی چینی کرێکار بوونەتە هۆکار و ڕێبازی پەیدابوونیان. لەبەرامبەر ئەمەشدا باشترین وەڵام بۆ ئەم تاوانبارکردنە ئەوەیە کە پەیدابوون و گەشەی مێژوویی سۆشیال دیموکراتی و کاروانی سەدەیەك لە بەردەوامبوونی بەشێکە لەو گۆڕان و پێشڕەوییانەی کە لە کرداردا هێنانەدی ڕێبازێکی بەهێزە بۆ ئازادیخوازی و گەشەی ئابووری و دەوڵەتی خۆشگوزەران.

له ڕوانگەی ئەم بیروبۆچونانەی هزری سۆشیال دیموکرات چەندین پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەکانی ئەوروپادا دروست بوون ، بەتایب لە کۆمەڵگەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، بەشێوەیەکی گشتیش ئەو ئەزمونەی ئەم پارتە سیاسیانە پێشکەشیان کردووە لە کۆمەڵگەکانیاندا ئەزمونێکی سەرکەوتووە و لە دەرەنجامدا کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران و ئارامی بەدیهێناوە کە تیایدا تاکەکان دەبنە هۆکار و ئامانج لە هەمان کاتدا، تایبەتمەندی سەرەکی ئەم کۆمەڵگەیانەش بریتی دەبێ لە پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و پرەنسیپی بەشداری هەمووان لە پرۆسە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان.

## ئەرکی پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان:

پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان لە کۆمەڵگەکاندا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ئەرکی گرنگ بونەتەوە کە لە کۆی گشتیدا بوونەتە پەیامی سەرەکی ئەو پارتە سیاسیانە و خودی ئەو کۆمەڵگەیانەش پێویستییەکی سەرەکییان بەم پەیامانە هەیە و هەر ئەم پەیامانەش بوەتە نەریتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوری لە خودی کۆمەڵگەکانی ئەوروپادا.

## لە گرنگترین ئەرکی پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان:

١. چەسپاندن و بەردەوامی خەباتی پەرلەمانی لەنێو کۆمەڵگەکان و ئاراستەکردنی لەپێناو بەردەوامی ململانێ سیاسیەکانی نێوان پارتەکان و لە دەرەنجامیشدا گشت ئەو ململانێیانە لە خزمەت بەدیهێنانی خواستەکانی تاکدا کۆدەبنەوە. پارتە سۆشیال

دیموکراتیەکان بەردەوامی خەباتی پەرلەمانی بە گرەنتی بەردەوامی دیموکراتی لە کۆمەڵگەدا دەزانن و هەمیشە کار بۆ ئەوە دەکەن پەرلەمانەکان فرەدەنگ بن و ئەوەش پەسەند ناکەن کە پارتێکی سیاسی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ زۆرینەی پەرلەمان بۆ خۆی قۆرخ بکات. ئەمەش لەرێی کارکردن لەسەر گۆڕینی ڕای گشتی ئەو کۆمەڵگایانە

٢. هەوڵدان بۆ چەسپاندنی چاکسازی لە کۆمەڵگەکاندا، بەوپێیەی پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان چاکسازی بە سەرەکیترین ڕێگا دادەنێن بۆ بەدیهاتنی خواستی تاکەکانی کۆمەڵگا بەگشتی و خواستی چینی کرێکاران بەتایبەتی، لەبەرامبەریشدا ئەم پارتانە هەموو شێوازێکی توندوتیژی و توندڕەوی بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکان ڕەت دەکەنەوە.

٣. پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان هەوڵدەدەن بۆ زاڵکردنی گرنگی کۆمەڵ بەسەر دەوڵەتدا، واتە دەبێ سەرجەم هەوڵەکان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە تەواوبن، ئاشکراشە کە کۆمەڵگە لە کۆی تاکەکان پێکهاتووە.

٤. برەودان بە بوونی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و چالاکبوونی ڕۆڵیان یەکێکە لە ئەرکە سەرەکیەکانی پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان ، کە بە بڕوای ئەوان لە کۆمەڵگەکاندا ئەو ڕێکخراوانە دەبنە تەواوکەری ئەرکەکانی دەوڵەت و هەر ئەوانیش

گرەنتی بەردەوامی سیستەمێکی دیموکراتیانە دەکەن، ئەمەش بە ئاشکرا لەو بوونە فراوانە لەڕووی چۆنێتی و چەندێتی ئەو ڕێکخراوانەوە دەردەکەوێت.

٥. لەڕووی ئابوورییەوە پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان کاردەکەن بۆ بەردەوامی و بەدیهێنانی سیستەمێکی ئابووری، کە لەلایەك تاکەکان ئیستغلال نەکات و لەلایەکیش هەموو پێوەرە ماددی و مەعنەوییەکان تەنها بە ئابووری نەپێورێت، بەڵکو هێڵێکی ناوەند ئەدۆزێتەوە لەنێوان ئەو دوو حاڵەتەدا، بۆ نموونە بەشێکی سەرەکی بانگەشە هەڵبژاردنیەکانی پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان پەیوەستە بە بواری ڕێکخستنی یاسای باج و چۆنێتی بەکارهێنانی لەلایەن دەوڵەتەوە.

٦. لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان کار بۆ ئەوە دەکەن کە کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران بێتەکایەوە و لەم نێوەدەشدا گرنگیدان بە بابەتەکانی تەندروستی تاك و ژینگەیەکی دروست و یاساکانی تایبەت بە بیمەی کۆمەڵایەتی و تەمین. لە گرنگترین ئەو بابەتانەن کە لە ئەجێندای بەنامەی کاری ململانێی نێوان پارتە سیاسیە سۆشیال دیموکراتەکان لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا بەدی دەکرێت.

پارتی سیاسی لە زۆربەی سیستەمە سیاسیەکانی جیهانی ئەمرۆدا بوونی هەیە، جا ئەو سیستەمە سیستەمێکی تاك حزبی بێت یان فرەحزبی. هەندێجار لە پاڵ ئەم سیستەمانەدا چەند پێکهاتەیەکی تریش سەرهەڵدەدەن. وەك پێکهاتەی حزبی سەرکردە، پێکهاتەی حزبیی کێبرکێ کە هەریەك لە پێکهاتەکانی دووحزبی، فرەحزبی، حزبی سەرکەوتوو دەگرێتەوە.

لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا جۆرێك لە سیستەمی حزبی پەیڕەو دەکرێت. دیاریکردنی ئەو سیستەمە حزبییەش بەپێی کۆمەڵگاکە دەگۆڕێت. لەرووی پراکتیکیشەوە دوو جۆرە سیستەم و پێکهاتەی حزبی هەیە: یەکەمیان ئەو پێکهاتانەیە کە مەودای کێبڕکێی حزبی لە کۆمەڵگەدا نیە کە ئەمیش دوو جۆری هەیە یەکێکیان پێکهاتەی تاك حزب و پێکهاتەی حزبی سەرکردە (القائد). جۆری دووەمی سیستەمە حزبییەکانیش بریتیەلەو پێکهاتانەی کە مەودای کێبڕکێی حزبی لە کۆمەڵگەدا دێننەکایەوە و ئەمیش سێ جۆری هەیە: یەکەمیان سیستەمی دوو حزبییەوە و دووەمیان سیستەمی حزبی براوەیە و سێیەمیشیان فرەحزبییە.

**هۆکارەکانی سەرهەڵدانی پێکهاتە حزبیەکان:**

چەندین هۆکار هەیە کە دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی پێکهاتە حزبیەکان، لە گرنگترینیان:

١. هۆكاری كۆمەلآیەتی–ئابووری:

لەبەرئـەوەی پـارتی سیاسـی ڕەنگدانـەوەی واقعێكـی كۆمەلآیـەتی دیـاریكراوە، هەربۆیـە تایبەتمەنـدی ئـەو ژینگـە كۆمەلآیەتیـە لەسـەر دروسـت بـوون و كـاركردنی ئـەو پارتـە سیاسـیە بـەڕوونی هەسـتی پێـدەكرێت. هێـزی ئـابووری كومەڵگـەش بـە هـەمان شـێوە كاریگـەری لەسـەر ڕەوتـی كـاركردنی پـارتێكی سیاسـی هەیـە، هـەروەكو ئەگـەر ژینگەی سـەرهەڵدانی پارتێكی سیاسـی سیسـتەمی سـەرمایەداری یـان سوشیالیسـتی تیـدا پـەیرەو كـرا، ئـەوا دەبـێ ئـەو پارتـە بە پێـی ئـەو سیستەمە خۆی بگونجێنێت كەپەیرەو دەكرێت.

٢. هۆكاری بیروبـاوەڕ و نەتەوەیی:

بـۆ هـەموو نەتەوەیـەك بیروباوەڕێـك و بـۆ هـەموو بیروبـاوەڕێكیش نەتەوەیەك هەیە كە لەسەری دەڕۆن. هەریەكە لە هۆكاری ئایـدیۆلۆژیا و نەتـەوە كاریگەرییان هەیـە لەسـەر سروشـتی پێكهاتـەی پـارت و ڕەوتـی كـاركردنی، بـە شـێوەیەك كـە لـە بنـەماكانی بیركردنـەوەی پارتەكـەدا كاریگـەری بەجێـدەهێڵێت، ئـەم كاریگەرییـەش لـە دوو ئاراسـتەی جیاوازدا دەبینرێت:

أ. ئاراسـتەیەكی سـلبی و نێگەتیڤانـە، بـەو مانایـەی جیـاوازی بیروباوەڕ و نەتەوە دەبێتەهۆی پەرت بوون و دروسـتكردنی تەكەتولات كە لە ئەنجامدا لە بەرژەوەندی پارتە سیاسیەكەدا نیە و بە ئاراسـتەی تێكشكانی دەبات .

ب. ئاراستەیەکی ئیجابی و پۆزەتیڤانە، بەو مانایەی فرە بیروباوەری و فرە نەتەوەیی دەبێتەهۆی دروست بوونی فرەڕەنگی و فرەدەنگیەك کە لە ئەنجامدا خزمەت بە پارتە سیاسیەکە دەکات و دەشێت بە هۆکارێکی گرنگ و بنەرەتی پێشکەوتنی پارتێکی سیاسی دابنرێت.

**گرنگترین پێکهاتە حزبیەکان:**

پێکهاتە حزبیەکان بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆرن:

**یەکەم: ئەو پێکهاتانەی مەودای کێبرکێیان تێدانیە:**

**بریتین لە:**

1. **پێکهاتەی تاك حزب:**

بە سادەترین مانا واتە ئەو پێکهاتەیەی کە مەودای کێبرکێی نێوان لایەنەکانی تێدا نابینرێت. پێکهاتەی تاك حزب پێکهاتەیەکی نوێ نیە و بە درێژایی مێژوو بوونی هەبووە. دەشێت پێکهاتەی تاك حزب بە گونجانێکی هونەری بۆ دیکتاتۆریەتێکی دیاریکراو دابنرێت.

لە گرنگترین نمونەکانی پێکهاتەی تاك حزبی بریتیەلە ( پارتی کۆمونیستی سۆڤێتی-پێشوو-)، هەروەها بەشێکی زۆر لەو پارتانەی کە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا و ولاتانی جیهانی سێیەمدا هەن. بۆ نموونە لە ئەفریقیادا نمونەی ئەم پارتانە هەبوو کە بە پێوەری دەستەبەرکردنی یەکێتی نیشتمانی و بەرەوپێشچوونی سیاسیانە و ئابوریانەی ولات دادەنرێ.

- تايبه‌تمه‌ندییه‌كانی پێكهاته‌ی تاك حزب:

١. ده‌سته‌بژێرێكی دیاریكراو فه‌رمانره‌وایی پارت ده‌كات.

٢. هه‌موو گه‌ل ده‌بنه حزبیی و خاوه‌نی هه‌مان بۆچونن.

٣. رۆشنبیریكردن و به‌رزكردنه‌وه‌ی ئاستی هۆشیاری خه‌ڵك ته‌نها به‌و ئاراسته‌یه‌دایه كه پارته سیاسیه‌كه ده‌یه‌وێت.

٤. تاك بۆی نیه ره‌خنه له بریار و راسپارده‌كانی پارت بگرێت و بۆچونی خۆی له‌وباره‌یه‌وه بدات.

٥. ده‌سه‌ڵات له لایه‌ن تاك حزبه‌وه قۆرخ ده‌كرێت و بۆ هیچ گروپ و لایه‌نێكی تر نیه به‌شداری پرۆسه و كاروباره سیاسیه‌كان بكات.

٦. رۆڵی تاك له‌م پێكهاته‌یه‌دا ته‌نها بریتیه‌له ئامرازێك بۆ به‌دیهێنانی ئامانجه‌كانی تاك حزب.

٧. له وولاّتانی دواكه‌وتوودا پێكهاته‌ی تاك حزبی بوه‌ته‌هۆی به‌دیهێنانی ئارامی سیاسی و ئابووری كۆمه‌ڵگه، به‌و پێیه‌ی ئه‌م وولاّتانه ناتوانن مامه‌ڵه‌یه‌كی ئیجابی له‌گه‌ڵ سیسته‌می فره‌حزبیدا بكه‌ن.

٨. رێگه نادات به بوونی پارتی سیاسی تر.

٩. تاك حزب ده‌گونجێت پێشكه‌وتنخواز بێت، واته ده‌گونجێت به‌ره‌وپێشچوونی ئابووری و بازرگانی به‌دیبهێنێت به‌لاّم ئه‌م به‌ره‌وپێشچوونه له‌سه‌ر ئاستی سیاسی كرانه‌وه به‌دی ناهێنێت.

ئه‌گه‌ر سه‌رنج بده‌ین له مێژوودا له هه‌ریه‌ك له وولاّتانی وه‌ك ئه‌لمانیا و ئیتالیا و یه‌كێتی سۆڤیه‌ت، تاك حزب بالاّده‌ست بووه. ئه‌و تاك حزبیه له یه‌كێتی سۆڤیه‌ت توانی شۆرشێكی ئابوری و كۆمه‌لاّیه‌تی له یه‌كێتی

سۆڤیەتدا بەرپا بکات، بەشێوەیەك یەكێتی سۆڤیەتی کردە یەکێك لە بەهێزترین وولاّتانی جیهان لەرووی تەكنەلۆژی و پیشەسازییەوە، بەتایبەتی لەبواری تەكنەلۆژیای سەربازیدا. بەلاّم تاك حزبی نازی بە سەرۆکایەتی (ئەدۆلف هتلەر) لە ئەلّمانیا و تاك حزبی فاشی بە سەرۆکایەتی (مۆسۆلینی) لە ئیتالّیا نەیانتوانی گۆرانکاری ئیجابی لە سیستەمی کۆمەلاّیەتی و ئابووری وولاّتەکانیاندا بکەن، هەرچەندە لە رووی سیاسیەوە تارادەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

## سیستەمی تاك حزبی

مەبەست لەسیستەمی تاك حزبی واتە کۆمەلّگەی سیاسی تەنها یەك جۆر ریّکخستنی سیاسی تیادا پەیرەو دەکریّت. ئەم سیستەمە هەندیّجار پیّی دەوتریّت (سیستەمی تاك حزبی ململانیّ).

سیستەمی تاك حزبی دووجۆری هەیە:

یەکەم: سیستەمی تاك حزبی ئایدۆلۆژی.

دووەم: سیستەمی تاك حزبی ولاّتانی دواکەوتوو.

### یەکەم: سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی:

بناغەی دروستبوونی ئەم شێوازەی سیستەمی تاك حزبی دەگەرێتەوە بۆ تیۆری مارکسیزم کەپیّی وایە میّژووی کۆمەلّگەی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە ململانیّی چینەکان کە لەکۆتایدا دەبێتە هۆی سەرکەوتنی چینی پرۆلیتاریا یان چینی کریّکاران و لەئەنجامدا سیستەمیّکی سیاسی دروست دەبیّت کە دەربری دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریایە کە لە سەرووەری یەك پارتی

سیاسـیدا دەردەکـەوێت کـە ئـەویش پـارتی کۆمۆنیـستیە. ئەوانـەی پاڵپشتی سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی دەکەن کۆمـەڵێك پاسـاو بـۆ ئەو سیستەمە دەهێننەوە.

**پاساوەکانی سیستەمی تـاك حزبی ئایدیۆلۆژی:**

**١. سروشتی پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگە:**

لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا کە لەسەر بناغەی دیکتاتۆریەتی چینی پرۆلیتاریـا دروسـتبووە هـیچ جـۆرە پێکـدانێکی بەرژەوەنـدی چینەکان بەدیناکرێت، هـەر لەبەرئـەوە بناغەیـەکی کۆمەڵایـەتی بـۆ فرەحزبـی نیـە بەپێـچەوانەی کۆمەڵگـەی سـەرمایەدارییەوە کـە بەرژەوەنـدی چینـەکان تیایـدا جیـاوازە و فرەحزبـی سـەر هەڵـدەدات لـەپێناو گەیـشتن بـە دەسەڵات.

**٢. گەشەپێدانی سیاسی و گۆڕانی ئایدولۆژی:**

تـاك حـزب لـەم سیـستەمەدا هۆکـاری گەشـەی سیاسـییە، کـە کـاری پـەروەردە و پێگەیانـدن و چـاندنی کۆمەڵـە بەهایـەکی دیـاریکراو و گۆڕینی شێوازی کولتوری سیاسی و بەها باوەکانی کۆمەڵگە لەئەستۆ دەگرێـت، ئەمـەش لـەرێی هـەوڵی حـزب لەسـەر ئاسـتی ئایـدیۆلۆژی لـەپێناو گـۆڕانی فکـر و دروسـتکردنی ئـەو مرۆڤـەی کـە پێـی دەوترێـت مرۆڤی سۆشیالیستی.

**٣. بڵاوبوونەوەی دیموکراتی لە پێکهاتەی ناوخۆی حزب:**

ڕێکخستنی تاك حزب لەسەر بناغەی دوو پرەنسیپ دروست دەبێت:

أ. **پرەنسیپی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ**: واتە قۆرخ نەکردنی دەسەڵات لەلایەن تاکەکەسەوە.

ب. **پرەنسیپی مەرکەزیەتی دیموکراسی**: واتە دروستبوونی هەموو ڕێکخستنەکانی پارت لە خوارەوە بۆ سەرەوە لەرێی هەڵبژاردن و بەشداری هەموو ئەندامان لە تاووتوێکردنی سیاسەتەکانی پارت و بڕیارەکانی لەگەڵ ملکەچی کەمینە بۆ زۆرینە.

**٤. نەبوونی ململانێی ئایدۆلۆژی:**

لە حاڵەتی چەسپاندنی سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی تیۆری مارکسیزم دەبێتە تێڕوانینی گشتی گەل بۆ هەموو جیهان. ئەم تێڕوانینەش بەرژەوەندی سەرەکی کرێکاران لەبەرچاو دەگرێت. ئەو ئایدۆلۆژیایانەی کە تاکە حزب لە سیستەمی تاك حزبیدا هەڵیگرتووە خاوەنی دەزگا و دامەزراوەکانی رای گشتییە لە رۆژنامە و چاپخانە و رادیۆ و تەلەفزیۆن و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە و زانکۆکان و... هتد، ئەو پارتانەش هەریەك لەم دامەزراوانە لەپێناو بەرژەوەندی فکری خۆیدا بەکاردەهێنن.

**٥. گوزارشتکردن لە بەرژەوەندییە جیاوازەکان؛**

مەرج نییە گوزارشتکردن لە بەرژەوەندییە جیاوازەکان تەنها بە بوونی سیستەمێکی فرە حزبی ئەنجام بدرێت، بەڵکو دەکرێت لەناو تاکە پارتێکی سیاسیدا هەریەکە لە سەندیکاکانی کرێکاران و جوتیاران و رێکخراوەکانی گەنجان و رێکخراوەکانی ژنان و کۆمەڵی زانستی و کولتوری و هونەرییەکان...هتد. گوزارشت لە

بەرژەوەندیەکانیان بکەن، تاک حزبیش بەرژەوەندیەکانیان پێکەوە گرێدەدات لە چوارچێوەی سیستەمی سۆشیالیستی.

### ٦. گشتگیری پرۆسەی گەشە پێدان:

لەڕێی نمونەی سیستەمی تاک حزبی لەچین دەبینین تاک حزب نەك هەر دەتوانێت هەنگاوی خێرا بنێت بە ئاراستەی گەشەپێدانی ئابوری و کۆمەڵایەتی، بەڵکو گەشەپێدان دەکاتە پرۆسەیەکی هەمەلایەنە و گشتگیر. ئەگەر یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی پارت بریتی بێت لە بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی ماددی، ئەوا دەبێت ئەم ئامانجە لەڕێی گەشەپێدانی مرۆڤ و هاندانی بۆ بەهێزکردنی تواناکان و دواتر خستنەکاری لەپێناو بەرژەوەندی کۆمەڵگە بەدەستدێت. ئەمەش ئەرکی تاک حزبە کە کاردەکات لەپێناو هاندانی جەماوەر بۆ دژایەتیکردنی خودپەرستی و گۆڕینی توانا شاراوەکانی مرۆڤ بۆ توانای بەرهەمهێنان.

### رەخنەکان لە سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی:

سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی رووبەڕووی چەندین رەخنە بوونەتەوە بە تایبەتی لەماوەی سەرهەڵدانی و پێش روخانی یەکێتی سۆڤیەت و دواتریش شۆڕشی گەلان دژی پارتە کۆمۆنیستییەکان لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەلات بەشێوەیەك ئەم شێوازەی فەرمانڕەوایی تەنها لە کوبا و کۆریای باکور و چین ماوەتەوە لە گرنگترین ئەو رەخنانەش کە ئاراستەی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی دەکرێت بریتیەلە:

١. پارتێکی داخراو:

دەرگای بەئەندامبوون لەبەردەم هاووڵاتیاندا لەم جۆرە پارتانەدا واڵا نییە، بەشێوەیەك تەنها ئەو کەسانە بۆیان هەیە ببنە ئەندام کە دڵسۆزی پارتن. هەندێجار ئەو کەسەی داوای ئەندامێتی دەکات پێویستە پێشتر ببێتە ئەندام لە هەندێ دەستە و پێکهاتەدا کە ئەو پارتە دروستیکردووە. پاشان ئەو کەسە دەخرێتە ژێر ئەزموونەوە. دواتر بە کۆمەڵێك مەرج دەتوانێت ببێتە ئەندام لەو پارتەدا ئەمەش مانای وایە بواری بەشداری سیاسی هاووڵاتیان کەمدەبێتەوە.

بۆ نموونە پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی تا ساڵی ١٩٤٧ تەنها ٣٪ی هاووڵاتیان ئەندامبوون تیایدا و لە باشترین و بەرزترین حاڵەتدا لە ١٢٪ تێپەڕی نەکردووە.

٢. مەرکەزیەتی لەرادەبەدەر:

لە سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژیدا مەرکەزیەت و ڕێوشوێنی توند هەیە لەناو پارتدا بەشێوەیەك حزب و حکومەت تێکەڵ دەبن تەنانەت حزب کۆنترۆڵی حکومەت دەکات و سەرجەم بوارەکانی ژیان داگیر دەکات. بەمشێوەیە حکومەت نوێنەرایەتی گەل ناکات، بەڵکو نوێنەرایەتی تاکە حزبێك دەکات و پرەنسیپی سەروەری تاکە حزب جێگەی سەروەری گەل دەگرێتەوە.

### ٣. ڕێگەنەدان بەبوونی ئۆپۆزسیۆن:

سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی ڕێگە نادات بەبوونی پارت و دەستەی سیاسی ئۆپۆزسیۆن، ئەمەش بواری ئازادی ڕادەربڕین و ڕەخنەگرتن و پێکهێنانی دەستە و ڕێکخراوەکان تەسکدەکاتەوە. کە ئەمانەش پێچەوانەی بنەماکانی مافی مرۆڤن و لەئەنجامدا ئەو کەسانەی بۆچوونی جیاوازیان هەیە هەوڵی بەجێهێشتنی وڵات دەدەن.

### ٤. سەرکوتکردنی سیاسی:

سیستەمی تاك حزبی ئایدیۆلۆژی لەگەڵ سەرەتاییترین مافەکانی مرۆڤ و بنەماکانی دیموکراسیدا پێچەوانەیە و مرۆڤ دەکاتە هۆکار نەك ئامانج. هەروەها دژی دروستبوونی حکومەتە لەڕێی ئیرادەی جەماوەر بەشێوەیەکی ئازادانە. بەمانایەکیتر ئازادییە سیاسییەکان و مافە مەدەنیەکان بوونیان نییە و تاکرەوی سەرتاپای کۆمەڵگە دەگرێتەوە.

### دووەم: سیستەمی تاك حزبی لە وڵاتانی دواکەوتوو:

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانی دووەم و سەرەدەمی لەناوبردنی داگیرکارییە تەقلیدییەکان هەندێ دەوڵەت سەربەخۆییان وەرگرتووە و لەژێر ئینتیدابی داگیرکەرە جۆراوجۆرەکان هاتنە دەرەوە. بەمەش چەندین دەوڵەت دروستبوون کە هەندێکیان هەر لەسەرەتاوە سیستەمی تاك حزبیان پەیڕەو کردووە. هەندێکیتریش پاش ماوەیەك بەپێی یاسای قەدەغەکردنی پارتەکان و تەسککردنەوەی بواری ئازادییەکان دروستبوون. بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك سیستەمی تاك حزبی دروستبوون لەو شوێنانەی کەپێی دەوترا جیهانی سێیەم. ئەم

سیستەمانە بەرهەمی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو نەبوون بەڵکو لە ئەنجامی پرس و گرفتەکانی ئەو کۆمەڵگەیەوە هاتەکایەوە.

**پاساوەکانی سیستەمی تاك حزبی لە وڵاتانی دواکەوتوو:**

ئەوانەی پاڵپشتی سیستەمی تاك حزبی لە وڵاتانی دواکەوتوو دەکەن کۆمەڵێك پاساو بۆ پێویستی بوونی ئەم سیستەمە دەکەنەوە، لە گرنگترین ئەو پاساوانەش:

**١. پێداویستییەکانی پرۆسەی گەشەپێدان:**

پرۆسەی گەشەپێدان لە هەموو بوارەکاندا پێویستی بە بەرزکردنەوەی هێز و توانای کۆمەڵگە هەبوو. ئەم بەرەودانەش پێویستی بە بوونی تاکە حزبێکی سیاسی هەیە کە کاروباری جەماوەر رێکبخات و بەهاکانی گەشەپێدانی تێدا بچێنێت و بەرەو پێشەوەی ببات.

**٢. پاراستنی یەکێتی نیشتمانی وڵات:**

زۆر لە وڵاتانی دواکەتوو بەدەست گرفتی تایەفەگەری و ئاینی و جوگرافی و....هتد دەناڵێنن و هیچ کام لەم دەوڵەتانە بەتەواوی پێکهاتەی نیشتمانی خۆیان بۆ دروست نەبووە. هەر لەبەرئەوە سەرکردەی زۆربەی ئەم دەوڵەتانە پێیان وابوو فرەحزبی زیاتر ئەو گرفتانە قوڵدەکاتەوە و دەوڵەت بەرەو پەرتبوون دەبات، بەڵام تاك حزب دەتوانێت یەکێتی نیشتمانی لەوڵاتدا بەدەستبهێنێت و بیپارێزێت.

**٣. پێویستی هەبوونی ئارامی سیاسی:**

واتە بوونی ئاستێك لە ئارامی لە بارودۆخی سیاسی وڵات و سیستەمی سیاسیدا گرنگە بەمەبەستی كاركردن بۆ برەودان بە كۆمەڵگە و دوركەوتنەوە لە حاڵەتی دواكەوتن و دابینكردنی ئەم ئارامیەش لەلایەن سیستەمێكی تاك حزبیەوە دێتە ئاراوە.

**٤. بارودۆخی تایبەتی دژایەتیكردنی داگیركەر:**

سروشتی بارودۆخی تایبەتی وڵاتانی دواكەوتوو، كە توانیویەتی لەژێر دەسەڵاتی داگیركەر رزگاری ببێت، بوەهۆی ئەوەی كە تەنها پارتێكی سیاسی بتوانێت وڵات بەرەو پێشەوە ببات، چونكە هەر ئەو پارتە بوو لە رابردوودا توانی وڵات رزگار بكات لەژێر دەستی داگیركەر لەرێی خەباتێكی نیشتمانی ئاشتیانە بێت یان بەشێوەیەكی توندوتیژ.

**٥. نەگونجانی ژینگەی كۆمەڵایەتی بۆ فرەحزبی:**

بوونی فرەحزبی پێویستی بە ئاستێك لە پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی هەیە، ئەم پێشكەوتنەش لە كۆمەڵگە دواكەوتوەكاندا بەدیناكرێت هەروەك پەیوەندییە سیاسییەكان تێكەڵ بە پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان بووە و لێهاتوویی و توانای پێوەری كاركردن نیە.

**رەخنەکان لە سیستەمی تاك حزبی لە ولآتانی دواکەوتوو:**

**١. قۆرخکردنی دەسەلات:**

سیستەمی تاك حزبی لە جیهانی سێیەمدا کاردەکات لەپێناو قۆرخکردنی دەسەلات بەمانای ئەوەی کۆمەڵێك یان دەستەبژێرێك دەسەلات دەگرنەدەست و دەبنە هەڵگری سیفەتە جوانەکان و ئەوەی دژیانە هەڵگری سیفەتە خراپەکانە. لە هەندێك لەم ولآتانەدا دەسەلآت کەوتوەتە دەستی تەنها کەسێك و ملکەچی بۆ ئەو سەرکردەیە گەیشتوەتە بەرزترین رادده و ئەو سەرکردەیە دەبێتە بڕیاردەر لە هەموو کاروبارەکانی ولآت.

**٢. دیاردەی بیرۆکراتی:**

سروشتی سیستەمی تاك حزبی لە ولآتە دواکەوتووەکاندا سروشتێکی کارکردنی ئیداری و بیرۆکراتیەتی پێوە دیارە. بەشێوەیەك ئیدارە لە سەروو سیاسەتەوەیە. گرنگیدان بە سیاسەت و کاری سیاسی کەم دەبێتەوە و ئەندامێتی لەو پارتەدا دەبێتە کارێکی رۆتینی و پەیوەست بە بەرژەوەندییەوە. بەمشێوەیە چالاکییەکانی پارت لە بەرزکردنەوەی راپۆرت بۆ ئۆرگانەکانی سەروتر کورت دەبێتەوە و کاری پارت لە دروستکردنی بڕیاری سیاسییەوە دەگۆڕێت بۆ رۆڵێکی جێبەجێکاری لاوەکی.

٣. بڵاوبوونەوەی گەندەڵی:

لە سیستەمی تاك حزبی لە وڵاتە دواكەوتووەكاندا چاودێری گەل لەسەر كاری سیاسی و ئیداری بوونی نیە. بەمەش شێوازەكانی گەندەڵی سەرهەڵدەدات و وڵات رووبەرووی قەیرانێك دەبێتەوە كە كاریگەری سلبی دەبێت لەسەر رۆڵ و كاری سیستەمی سیاسی دەسەڵات.

ب: پێكهاتەی پارتی سەركردە:

ئەو پارتەیە كە خاوەنی فراوانترین بنكەی جەماوەرییە لەچاو پارتەكانیتری كۆمەڵگەدا و توانای رۆچوونی هەیە لە سەرجەم بوارەكانی ژیانی خەڵكدا. هەروەها بەرێوەبەری سەرەكی كاروباری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی كۆمەڵگەیە بەپێی ئەو رۆڵە مێژووییەی كە گێراویەتی، بەمەش دەبێتە تەنها خاوەنی دەسەڵات و پارتەكانیتری كۆمەڵگەش دان بەو رۆڵەیدا دەنێن.

تایبەتمەندییەكانی پێكهاتەی پارتی سەركردە:

١. رۆڵێكی مێژوویی گەورەی هەیە لە خەباتی گەل.

٢. بەتەنها مامەڵە بە كاروبارەكانی دەوڵەتەوە دەكات بەپێی پرەنسیپەكانی خۆی.

٣. رێگە دەدات بە بوونی پارتی سیاسیتر، بە مەرجێك دان بە رۆڵیدا بنێن.

٤. پارتە سیاسیەكانیتری ناو كۆمەڵگە دان بە رۆڵیدا دەنێن.

٥. ئەو پارتانەیتر کە لە کۆمەڵگەدا لە گەڵیدان ناتوانن کێبرکێی لەگەڵدا بکەن.

**دووەم: ئەو پێکهاتانەی مەودای کێبرکێیان تێدایە:**

بریتین لە:

**أ. پێکهاتەی دووحزبی:**

ئەو پێکهاتەیەیە کە تیایدا کێبرکێ لەنێوان دوو پارتی دیاریکراودا هەیە لەسەر دەسەڵات و هەریەکەیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەڕێی هەڵبژاردنەکانەوە دەگەنە دەسەڵات و ئەویتریان بەردەوام چاودێرە بەسەر ئەو پارتەی کە دەسەڵات بەڕێوەدەبات.

زۆرجار جیاوازیکردن لەنێوان پێکهاتەی دووحزبی و پێکهاتەی فرەحزبی (کە دواتر باسی دەکەین) کارێکی ئاسان نیە، بەوپێیەی کە لە زۆر لەو پێکهاتە دووحزبیانەدا گروپ و کۆمەڵەی بچووك و هەندێجاریش پارتی سیاسیتر هەن. بۆ نمونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لەپاڵ هەردوو پارتی گەورەی (کۆماری و دیموکراتی) چەند پارتێکیتریش هەن وەکو (پارتی کرێکاران، پارتی جوتیاران، پارتی پێشکەوتنخواز). یان لە بەریتانیا لەپاڵ هەردوو پارتی گەورەی (کرێکاران و پارێزگاران) چەند پارتێکیتریش هەن وەکو (پارتی ئازادیخواز، پارتی کۆمەڵایەتی دیموکراسی). بەڵام سەرەرای ئەمانەش هەریەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بە دوو نمونەی سەرەکی دادەنرێن بۆ پێکهاتەی دووحزبی، لەبەرئەوەی

لەم دوو وڵاتەدا دەنگی هاووڵاتیان بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان ئەو دوو هێزەدا دابەش بووە.

**پێکهاتەی دووحزبی لە هەریەك لەم دوو وڵاتەدا جیاوازە، گرنگترین ئەو جیاوازیانەش:**

١. پارتە سیاسیەکان لە بەریتانیا جۆرێك لە مەرکەزیەتیان پێوەدیارە، ئەم مەرکەزیەتە لە پارتی کرێکاراندا بەهێزە و لە پارتی پارێزگاراندا لاوازە، بەڵام لیژنەی پارتە سیاسییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەربەخۆییەکی فراوان هەیە لە کارکردن و بڕیاردەرکردن.

٢. پێکهاتەی پارتە سیاسیەکانی بەریتانیا لەسەر بناغەی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان دروست بووە، هەروەك چینی محافزکار و چینی لیبراڵ و چینی کرێکاران هەن، فکر و بیروباوەڕی هەر پارتێکی سیاسیش رەنگدانەوەی چینە کۆمەڵایەتیەکەیەتی.

بیرمەند (مارسیل ڤالین) لەبارەی پێکهاتەی دووحزبییەوە دەڵێت: (پێکهاتەی دووحزبی لە دیموکراسیەتی لیبراڵیدا بریتیەلە فەرمانڕەوایی زۆرینە، بەڵام پێویستە لەهەمان کاتدا ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز هەبێت کە بتوانێت چالاکانە رەخنە لە زۆرینەی دەسەڵاتدار بگرێت و لە هەوڵدانەدا بێت بۆ ئەوەی ببێتە زۆرینە لە قۆناغەکانی

داهـاتوودا و ڕێگربێـت لەبـەردەم قـۆرخکردنی دەسـەڵات لـە دەسـتی پارتێکی سیاسی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی نیمچە هەمیشەیی).

**بەم پێیە گرنگترین ڕۆلی ئۆپۆزسیۆن لە سیستەمێکی دیوکراسیدا بریتیەلە:**

١. نوێنەرایـەتیکردنی پرۆسـەی ڕەخنـەگرتنی بنیاتنەرانـە لـە بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی سیستەمی سیاسی و حکومەت و دەوڵەت.

٢. دژایـەتیکردنی ئـەو بڕیارانـەی کـە نادیموکراسـین و ڕێگەخۆشکەرن بۆ قۆرخکردنی دەسەڵات و دروستبوونی شێوازێك لە دیکتاتۆرییەت.

٣. ئامادەسـازی و هەوڵـدان بـۆ بوونـە زۆرینـە لـە قۆنـاغێکی داهاتوودا، گرنگ نیە ئەو قۆناغە نزیك بێت یان دوور.

بـەهۆی ئـەوەی لـە پارتـە سیاسـییەکانی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکادا ئایـدیۆلۆژیا و پێکهاتـەی چینایەتی کاریگـەری و ڕۆڵێکـی ئەوتۆی نیە، هەربۆیە دەبینین جیاوازی نێوان پارتە سیاسییەکان زیاتر لە پلە و ئاستی جەماوەریبوونیاندایە نەك لە شێوازی پێکهاتنی پارتـە سیاسییەکە. لەم بارەیەوە بیرمەند (سیکموند نیومان) دەڵێت: (بناغـەی کارکردنی پارتە سیاسییە ئەمریکیەکان بریتیەلە یەکێتی نیشتمانی کە ئەمەش دەبێتـەهۆی سـەرهەڵدانی جیاوازییـەکان لەسەر ئاسـتی ڕێـژەی جەماوەر، نەك لەسەر ئاستی بیروباوەر و ئایدیۆلۆژیا).

**ب. پێکهاتەی فرەحزبی:**

بـۆ ئـەوەی بـزانین کـە لـە وڵاتێکـدا سیـستەمێکی فرەحزبـی هەیـە پێویستمان بە دوو پێوەرە، یەکەمیان پێوەرێکی چەندێتییە، کە تیایـدا

پێویسته سێ حزب یان زیاتر له کۆمەڵگەیەکدا هەبێت چالاکییه سیاسیەکانیان له کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا به ئەنجام دەگەیەنن. پێوەری دووەمیش پێوەری چۆنێتیه کە بریتیەله بوونی کۆمەڵێك بنەمای سەرەکی لەو کۆمەڵگەیەدا که تیایدا دیموکراسیەت و فرەحزبی پێدەناسرێتەوه.

ئەو وڵاتانەی که پێکهاتەی فرەحزبییان تێدایه بریتین له زۆرینەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا به تایبەتی وڵاتانی (فەرەنسا، بەلجیکا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، دەوڵەتانی ئەسکەندەنافیا).. (ئەم باسه به درێژی له بابەتی سیستەمی فرەحزبی باسکراوه).

**سیستەمی فرەحزبی**

پەیوەندییەکی بەهێز هەیه لەنێوان دیموکراسیەت و فرەحزبی، دیموکراسیەت بوونی نیه بەبێ بوونی فرەحزبی، هەروەك هەندێ له بیرمەندان پێیان وایه دیموکراسیەت واته حکومەتی فرەحزبی ئەم دیموکراسیەتەش چەندین ناوی لێنراوه وەك (دیموکراسیەتی رۆژئاوا، دیموکراسەتی لیبراڵی، دیموکراسیەتی فرەیی).

**بنەما فکرییەکانی سیستەمی فرەحزبیی:**

بنەمای فکری و فەلسەفی سیستەمی فرەحزبی له چەند چەمکێکی سەرەکییەوه سەرچاوه دەگرێت گرنگترینیان:

**١. بنەمای سەروەری گەل:**

بەپێی ئەم چەمکه گەل خاوەنی بریاری کۆتاییه له مەسەله چارەنوسسازەکاندا. هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم بنەمایه بریتیەله

هەوڵدان بۆ سنورداركردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەواكان لەسەر بناغەی ئەم بنەمایــەش دەســتوورەكانی ئــەورووپا داڕێــژراوە لــە دوای شۆڕشــی فەرەنسا.

٢. بنەمای ئیرادەی زۆرینە:

ئەم بنەمایە راستییەكی دەرخست كە بریتیە لەوەی كۆدەنگی لەسەر هــیچ بابــەتێك نییــە و هاووڵاتیــانیش هــەمان هەڵوێــستیان نیــە، بــەڵام هەمیشە كەمینە نەبێت ملكەچی ئیرادەی زۆرینە بێت.

٣. بنەمای ئازادی نەیاریكردن (ئازادی ئۆپۆزسیۆن):

ئـەم بنەمایـە مانـای وایـە لـە كاتی ملكەچبوونی كەمینـە بـۆ ئیرادەی زۆرینـە دەبێت بـوارێكی فـراوان بڕەخـسێت بـۆ ئـازادی بۆچـونەكان و رەخنەگرتن. هـەروەها دەبێت ئـەو كەمینەیە ئازاد بێت لـە هەوڵدان بـۆ راكێشانی خـەڵكانی زیـاتر بـە ئاراسـتەی بۆچوونەكانی و لـە ئەنجامـدا ئەوانیش ببنە زۆرینە. (ئەو نەیاریكردنەی لێرەدا مەبەستمانە بریتیەلـە نەیاریكردنێكی ئاشتیانە).

٤. پرەنسیپی تـاكگەرایی:

مەزهەبی تاكگەرایی بەردی بناغـەی فكـری لیبرالییـە، لەسـەر بنـەمای ئەو گریمانەیە دروستدەبێت كە پێی وایە مرۆڤ پێش بوونی دەوڵـەت و دەسەڵات خاوەنی ماف و ئازادی سروشتی خۆیەتی. ئەرك و ئامانجی دەوڵەت دەبێت بریتی بێت لـە پاراسـتنی ئـەو مـاف و ئازادییانە. كۆی بەرژەوەندییەكانی تاك لەكۆتاییـدا بریتیەلـە بەرژەوەندییـەكانی كۆمـەڵ.

واتە کاتێك دەوڵەت بەرژەوەندی تاك دەپارێزێت ئەوا بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵی پاراستووە.

### ٥. بنەمای دەوڵەتی پارێزەر:

بەو مانایەی دەوڵەت تەنها دەبێت پارێزەری ماف و ئازادییەکانی تاك بێت و حکومەت و دامودەزگاکانی بەدوور بن لە هەر دەستێوەردانێك لەو ماف و ئازادییانە. واتە دەوڵەت تەنها ڕۆڵی پاسەوانێك بۆ بەرژەوەندییەکانی تاك و هاووڵاتییان دەبینێت.

### ٦. بنەمای ئازادییە گشتییەکان:

ئەم چەمکە چەند جۆرێك لەماف دەگرێتەوە کە لەو مافە سەرەتاییانەوە دەست پێدەکات کە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨ پەسەندیکردووە، وەك مافە کەسێتییەکان (وەك مافی موڵکایەتی، مافی گواستنەوە، مافی فێربوون،....هتد)، هەروەها مافە مەعنەوییەکان (وەك مافی ئازادی ئاین، مافی ئازادی بۆچوون و رادەربڕین، مافی ئازادی رۆژنامەگەری، مافی ئازادی بڵاوکردنەوە،....هتد)، لەگەڵ مافە سیاسییەکان (وەك مافی هەڵبژاردن و دەنگدان و خۆپاڵاوتن مافی دروستکردنی کۆمەڵە و ڕێکخراو و بەئەندامبوون تیایاندا و مافی بەشداری لەهەر چالاکییەکی سیاسی)، ئەمە سەرەڕای مافە سەندیکاییەکان (وەك مافی دروستکردنی سەندیکا و پارت و مافی هەڵبژاردنی پیشە).

٧. چەمکی یەکسانی مەدەنی یان یەکسانی لەبەردەم یاسادا:

بەمانای جێبەجێکردنی یاسا بەسەر هەمواندا بە یەکسانی و بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان تاکەکاندا بەهۆی رەگەز و ئاین و زمان و رەنگ و نەتەوە و ئاستی کۆمەلایەتی و جێندەر...هتد. هەروەك فەیلەسوف (ژان ژاك رۆسۆ) لە پەیمانی کۆمەلایەتیەکەیدا باسی دەکات و دەڵێت: (یاسا کۆمەڵێك ریسای گشتی بێلایەنە)، هەروەها (راگەیەنراوی شۆرشی فەرەنسی بۆ مافەکانی مرۆڤ) دەڵێت: (مرۆڤەکان بەئازادی لەدایك دەبن و یەکسانن لە مافدا).

رەخنەکان لە سیستەمی فرەحزبی:

سەرەرای ئەو لایەنە پۆزەتیڤانەی لە بەرجەستەبوونی سیستەمێکی فرەحزبیدا هەیە، بەلام ئەم سیستەمەش بەدوورنیە لە هەندێ رەخنە و خاڵی نێگەتیڤ. لەگرنگترین ئەو رەخنانەش:

١. ناجێگیری سیاسی و ئیداری:

لە سیستەمی فرەحزبیدا دەسەلات لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکیتر دەگوازرێتەوە بەپێی گۆرینی ئاراستەی رای گشتی کۆمەڵگە. ئەمەش کاریگەری لەسەر هێزی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان هەیە سەبارەت بە شێوازی دارشتن و جێبەجێکردنی کاروبارە گشتیەکان.

ناجێگیری سیاسی و ئیداری لەو کاتانەدا بە تایبەت دەردەکەوێت کە پارتێکی سیاسی ناتوانێت بەتەنها زۆرینەی رەهای کورسیەکانی پەرلەمان بەدەست بهێنێت و لەئەنجامدا ناچار دەبێ حکومەتێکی

ئیئتلاف لە چەند پارتێك پێك بهێنێت. هەریەك لەم پارتانەش بۆچونی دیاریکراو و تایبەتی خۆی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی دەسەلأت، بەمەش جۆرێك لە ناجێگیری سیاسی و ئیداری سەرهەڵدەدات.

**٢.مەترسی نەبوونی دیموکراسیەت لە ناوخۆی پارت و دەسەلأتداربوونی دەستەبژێر:**

یەکێك لەو رەخنانەی کە ئاراستەی پارتە سیاسیەکان بەگشتی دەکرێت ئەوەیە کە دەسەلأت تیایاندا لە دەست دەستەبژێرێکی دیاریکراودا قۆرخ کراوە. بەمەش یەکێك لە چەمکە سەرەکیەکانی دیموکراسیەتی لیبرالی لەناودەچێت کە بریتیەلە دەسەلأتی زۆرینە. چونکە لە بەرامبەردا دەسەلأتی کەمینەیەکی دەستەبژێر جێگەی دەگرێتەوە.

**٣.مەترسی کاریگەری بەرژەوەندیە ئابوورییە گەورەکان لەسەر پارت:**

لە سیستەمە فرەحزبیەکاندا هەمیشە پارتە سیاسیەکان پشت بە کۆمپانیا بازرگانیە گەورەکان و دامەزراوە پیشەسازییەکان دەبەستن لە ئەنجامدانی کارەکانیان. هەریەك لەم کۆمپانیا و دامەزراوانەش بەرامبەر بە کۆمەڵێك خواست و داواکاری یارمەتی ئەو پارتانە دەدەن داواکاری ئەو دامەزراوە بازرگانی و پیشەسازییانە لە زۆر حاڵەتدا داواکاری ئابوورین. کە بە پێی بۆندێك هاوکاری پارتێکی سیاسی دەکات بەتایبەت لە بواری داراییدا لە بەرامبەر جێبەجێکردنی داخوازییە ئابوورییەکانی. ئەم حاڵەتە بەڕوونی لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکاندا بەدی دەکرێت.

هەندێجار پارتە سیاسیەکان دەکەونە ژێر کاریگەری داخوازییەکانی ئەم کۆمپانیا و دامەزراوە بازرگانیانەوە و لە ئەنجامدا کاریگەری سلبی ئەبێت لەسەر ئەنجامدانی کاروبارەکانی حکومەت و سیاسەت و کاری پارتی سیاسی بە شێوەیەکی نیجابی.

٤. سەرهەڵدانی جۆرێك لە ئاژاوەگێری سیاسی:

لە سیستەمی فرەحزبیدا هەریەك لە پارتە سیاسیەکان هەوڵ دەدەن هێرش بکەنە سەر بۆچونەکانی پارتەسیاسیەکانیتر و راوبۆچونەکانی خۆیان بە شیاوتر و گونجاوتر دەزانن و بەرگری لێدەکەن و بۆچونی بەرامبەرەکانیان رەت دەکەنەوە. هەندێجار شێوازی رەتکردنەوەی بۆچونەکانی بەرامبەر بەرەو ئاراستەی بەکارهێنانی زمانێکی توند لە دیالۆگی سیاسی سەردەکێشێت. لە هەندێ حاڵەتدا بەکارهێنانی ئەو زمانە توندە دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی ئاژاوەگێری.

٥. فرەحزبی پەیوەستە بە رێکخستنی سەرمایەداری کۆمەڵگەوە:

سەرهەڵدانی سیستەمی فرەحزبی هاوکات بووە لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستەمی سەرمایەداری. سەرمایەداریش سەرەرای ئەو سەرکەوتنە گەورانەی بەدەستی هێناوە لە شێوازی بەکارهێنانی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و داهێنانی هۆکاری بۆ راپەراندنی کارەکان. لە هەمان کاتدا بوەتەهۆی سەرهەڵدانی جۆرێك لە ناعەدالەتی، بەتایبەتی لەنێوان سەرمایەدار و کرێکار و ئەو قۆرخکردنەی لە بازاڕی ئازاددا روودەدات.

ماوەتەوە بڵێین هەریەك لەم رەخنانە دەگونجێت واقعی بن، بەڵام لە گرنگی و شیاوی و بەهای سیستەمی فرەحزبی کەم ناکەنەوە.

ج. پێکهاتەی پارتی براوە (سەرکەوتوو-زۆرینە):

دیاردەی پارتی سەرکەوتوو لەو سیستەمانەدا هەیە کە دیموکراسی و هەڵبژاردن بونیان هەیە و لەرێی هەڵبژاردنەکانەوە پارتێکی سیاسی بۆماوەیەکی دوور و درێژ لە دەسەڵاتدا دەمێنێتەوە. ئەم پارتە سیاسیەی کە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان دەباتەوە دوو تایبەتمەندی سەرەکی تێدایە:

١. لە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکاندا رێژەی دەنگەکانی لە هەموو پارتەکانیتر زیاترە.

٢. گەل و جەماوەر پشتگیری دەکەن و ئایدیۆلۆژیا و پرەنسیپەکانی دەچەسپێنن.

لەم بارەیەوە بیرمەند (مۆریس دۆڤرجیە) پێی وایە پێکهاتەی پارتی براوە هێڵی ناوەندە لەنێوان پێکهاتەی (تاك حزب) و پێکهاتەی (فرەحزبی). بەڵام لەراستیدا زیاتر لە پێکهاتەی فرەحزبی نزیکترە. هەرچەندە لە قۆرخکردنی دەسەڵات و مانەوەی تیایدا تارادەیەك لە تاك حزب دەچێت، بەڵام ئەم مانەوە زۆرەی دەسەڵات لە پێکهاتەی (پارتی براوە)دا شەرعیە، چونکە لە رێگەی دەنگدانەوە لە پرۆسە هەڵبژاردنەکاندا ئەو دەسەڵاتە دەگرنەدەست و لە هەمان کاتدا پارتە سیاسییە ئۆپۆزسیۆنەکان بە ئازادانە چالاکیەکانیان ئەنجام دەدەن.

ئەمە لە کاتێکدا کە تاك حزب لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لەڕێی بەکارهێنانی هێزەوە، شۆرش یان کودەتا، دەگەنە دەسەلأت و بە هیچ شێوەیەکیش ڕێگە بە کارکردنی پارتی سیاسیتر و هیچ جۆرە چالاکیەکی سیاسی نادات.

سەرهەڵدانی پارتی سیاسی و دروستبوونی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابوری و فیکری ئەو کۆمەڵگایەی ئەو پارتەی تێدا دروست دەبێت و دەیەوێت کاری تێدا بکات، هەر لەبەرئەوە ئەرکی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت. لێرەدا باس لە ئەرکی پارتی سیاسی دەکەین لە دوو کۆمەڵگەی جیاوازدا.

**یەکەم: ئەرکی پارتی سیاسی لەکۆمەڵگەی دواکەوتوودا:**

لەبەرئەوەی پارتی سیاسی ڕەنگدانەوەی واقعی کۆمەڵایەتی و ئابوری و فکری کۆمەڵگەیە، هەربۆیە پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەی دواکەوتوودا ڕەنگدانەوەی ئەو واقعە دواکەوتووەیە کە ئەو کۆمەڵگانە پێوەی دەناڵێنن، ئەم حاڵەتەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر ئەرکەکانی پارتی سیاسی.

لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا پارتی سیاسی کۆمەڵێك ئەرکی دیاریکراوی هەیە کە هەندێجار لە بواری کاری سیاسی دەچێتە دەرەوە. لەم کۆمەڵگانەدا پارتی سیاسی هەوڵ دەدات دەست بەسەر دەسەلاتدا بگرێت بەڕێگەی ئاشتییانە یان بە توندوتیژی، دواتریش کە دەگاتە دەسەلات بڕوای بە گۆڕانکاری ئیجابیانە نیە بە ئاراستەی کرانەوەدا، هەربۆیە لەسەر شێوازێکی پارێزگارانە دەمێنێتەوە. بەلام دەبێت ئەوە بزانین کە هەندێجار لە هەندێك لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا پارتی سیاسی دروست دەبێت کە بڕوای بە گۆڕانکاری هەیە، ئەم پارتانەش زیاتر پارتی جەماوەرین، چونکە هەمیشە پرۆسەی گۆڕانکاری دەبێت بە جەماوەر بکرێت و لە

بەرژەوەندی جەماوەریشدا بێت، بەلاَم نمونەی ئەم جۆرانەی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا کەمە.

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بوترێت گرنگترین ئەرکەکانی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا بریتیەلە:

١. هۆکاری گۆڕانکارییە لە بارودۆخی کۆمەلاّیەتی و ئابوری کۆمەڵگەدا بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی حزب.

٢. ئەرکەکانی سنوری کاری سیاسی تێدەپەڕێنێت، بەومانایەی دەچێتە ناخی هەموو بوارەکانی ژیانەوە.

٣. ڕۆڵی سەرکردە لەم پارتە سیاسییانەدا ڕۆڵێکی کاریگەرە و کاریگەری کاریزما تیایدا زۆر سەرەکیە.

**دووەم: ئەرکی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا:**

سەرهەڵدانی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا، بەتایبەتی لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکور و ناوەڕاست، پەیوەست بوە بە گەشەی دیموکراتییەوە، کە کەشێکی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان دروست کردووە، لەبەرئەوە ڕۆڵ و ئەرکی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا زیاتر لە چوارچێوەی هەڵبژاردنەکاندا دەسوڕێتەوە، بەمەبەستی گەیشتن بە دەسەلاّت بەشێوەیەکی ئاشتییانە. ئەم ئەرکە پەیوەندیدارەش بە هەڵبژاردنەکانەوە لە سێ قۆناغدا کورت دەکرێتەوە کەبریتین لە:

١. دیاری کردنی پالێوراو بۆ هەڵبژاردنەکان:

ئەرکی سەرەکی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا بریتیە لە دیاریکردنی پاڵێوراوان بۆ بەشداریکردن لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکاندا. کە ئەمەش لەئەنجامدا دەبێتەهۆی دیاریکردنی فەرمانبەرانی حکومی و دیاریکردنی جۆری پلان و سیاسەتی حکومەت. دیاریکردنی ئەم پالێوراوانەش بەندە بە سیاسەت و هەڵوێستی ئەو پارتە سیاسییەی نوێنەرەکانی دەنێرێتە هەڵبژاردنەکانەوە. لە زۆربەی کاتدا ئەم دیاریکردنەش پەیوەستە بە ئاستی لێهاتوویی و توانای کارکردنی ئەو پالێوراوەوە.

٢. بەشداری لە پرۆسەی هەڵبژاردندا:

پرۆسەی هەڵبژاردن پێوەری ڕاستەقینەی هەڵسەنگاندنی چالاکی پارتە سیاسییەکانە، کاتێك لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە هاوڵاتیان ئەتوانن بەشداری سیاسییانەی کاروباری وڵات بکەن، گومانی تێدانیە پارتە سیاسییەکان ئەتوانن ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێت لە هاندانی لایەنگر و جەماوەریان بۆ پراکتیزەکردنی ئەم شێوازەی دیموکراسی. پەروەردەکردنی کادر و ئەندامانی پارتی سیاسی لەسەر عەقڵیەتی دیموکراسی و پەیرەوکردنی هەڵبژاردن لە زۆربەی پرۆسە سیاسیەکاندا دەبێتەهۆی گەشەسەندنی ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو پارتە سیاسیە تێیدا باڵادەست دەبێت، بەشێوەیەك کە پەروەردەی دیموکراسی دەگوازرێتەوە بۆ ناو خودی کۆمەڵگە.

## ڕێکخستن و پلاندانان:

(ئۆستن ڕەنی) دەڵێت هەموو حکومەتێکی دیموکراسی پێویستی بە بڕێکی زۆر لە ڕێکخستن هەیە، یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا بریتییەلە ڕێکخستنی حکومەت، ئەمەش لە هەردوو حاڵەتی پێش گرتنەدەستی دەسەلأت، یان دوای گەیشتن بە دەسەلأت، لە یەکەمیاندا وەك ئۆپۆزسیۆن و لە دووهەمیش وەك بەڕێوەبەری کارەکانی حکومەت، واتە ڕاپەڕێنەر و جێبەجێکاری دەسەلأتی جێبەجێکردنە لە ولأتدا، بۆ ئەم کارەش بابەتی پلاندانان سەرەکیترین قۆناغە کە دەبێتە هەنگاوی سەرەکی بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کارەکان، لەنێو پرۆسەی پلاندانانیش بابەتی پلانی ستراتیژی لەپێش هەموو بابەتەکانەوەیە، مەبەستیش لە پلانی ستراتیژی ڕێکخستنی کاروبارەکانە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن.

## ئەرکی پارتی سیاسی لە سیستەمی فرەحزبیدا:

بەوپێیەی بەشێك لە کۆمەڵگەکانی جیهان لە ئێستادا هەوڵدەدەن هەنگاو بەرەو سیستەمێکی فرەحزبی بنێن، هەربۆیە پێویستە بزانرێت کە ئەکری پارتە سیاسییەکان لە سیستەمێکی فرەحزبیدا چییە.

### ١. بەڕێوەبردنی ململانێی سیاسی لەکۆمەڵگەدا:

پارتی سیاسی جۆرێکە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵگە و ئارەزووی بەئەندامبوون تیایاندا یەکێکە لە غەریزە سەرەکییەکانی مرۆڤ. هەریەك لە مرۆڤەکانیش لایەنداری خۆیان بۆ لایەنێك یەکلایی کردۆتەوە.

بەمـــەش فرەلايەنييـــەك دروســـتبووە كـــە لەنێوانيانـــدا كێبڕكێيـــەك ســـەريهەڵداوە كـــە چـــەندين شـــێوازی وەرگرتـــووە، وەك ململانێـــی توندوتيژانـــە و ململانێـــی ئاشـــتيانە. باشـــترين شـــێوازی ململانـــێش بريتيەلە ململانێيەكی ئاشتيانە. پارتی سياسی سەرەكيترين دەزگا و دامەزراوەكانی كۆمەڵگەيە بۆ دوورخستنەوەی كۆمەڵ لە ململانێيەكی توندوتيژانە. ئەم ئەركەش پێويستی بە چەند تايبەتمەندييەك هەيە كە پێويستە لەهەر پارتێكی سياسييدا گرنگييەكی تايبەتی پێ بدرێت بۆ ئيدارەكردنی ململانێيەكی سياسی.

لە گرنگترين ئەو تايبەتمەندييانەش:

ب. چۆنێتی سەركردايەتی پارتەكان. واتە ئاراستە و لێهاتنەكانی سەركردە.

ت. رادەی فراوانـــی بنكـــەی جـــەماوەری پـــارتی سياســـی و بڵاوبوونەوەی لە سەرتاسەری وڵاتدا.

پ. سروشـــتی پەيوەنـــدی ئـــەو پارتانـــە بـــە پێكهاتـــە و دامـــەزراوە حكوميەكانەوە.

### ٢.دابينكردنی ئازادييە گشتييەكان:

فرەحزبی لە بناغەدا لەسەربوونی فرەبۆچوونی بنياتدەنرێت. كاتێك كەسێك دەبێتە ئەندام يان لايەنگری پارتێك لەسەر بناغەی لايەنگريان بۆ بۆچوونەكانی ئەو پارتە دەبنە ئەندام و دواتر دەيانەوێت پارێزگاری لـــەو بۆچـــوونانەيان بكـــەن. شـــێواز و حاڵـــەتی پارێزگـــاريكردن لـــەو بۆچونانەش تـەنها لـە سيستەمی فرەحزبيـدا فەراهـەم دێـت. پێويـستە لەسەر پارتی سياسيش ياريدەدەر و دابينكەری ئەو ئازادييە گشتييانە

بێت و دواتریش هاوشانی پارتەکانیتر لە سیستەمێکی فرەحزبیدا ئەو ئازادییە گشتییانە بپارێزن.

### ٣. فراوانکردنی بنکەی بەشداری سیاسی و وەرگرتنی رای گشتی:

یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی پارتی سیاسی لە سیستەمی فرەحزبیدا بریتیەلە هاندانی هاوولاتییان لەسەر بەشداری سیاسی و کارکردن لەپێناو پێشخستنی سیاسییانەی کۆمەڵ. ئەمەش لە زۆر حاڵەتدا بە ئەندامێتی یان لایەنگریکردن بۆ پارتێکی سیاسی دێتەدی.

بۆ زانینی رێژەی بەشداری سیاسی لەهەر کۆمەڵگەیەکدا پێویستە چەند هۆکارێك لەبەرچاو بگرین. لە گرنگترینیان:

أ. ئەو بەهایانەی کە دەستەبژێری دەسەڵاتدار پشتگیری دەکەن و راددەی رێگرتن یان هاندانی ئەو بەهایانە بۆ بەشداری سیاسی.

ب. کۆدەنگی کۆمەڵگە لەسەر گرنگی بەشداری سیاسی و رۆڵی فرەبۆچوونی.

ت. بەهێزی و نەرمی سیستەمی حزبی لە دابینکردنی بەشداری سیاسی بۆ نەوە نوێیەکان.

### ٤. نوێگەری و گەشە پێدانی سیاسی:

پارتی سیاسی رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە گۆرینی بارودۆخێکی دواکەوتووی کۆمەڵگە کە لەسەر بوونی دامەزراوەکان بنیات دەنرێت و هەریەك لەم دامەزراوانە ئەرك و رۆڵی خۆی پێدەدرێت.

نوێگەری واتە پرۆسەی پەرەپێدان، کە لەگەڵیدا دامەزراوەکانی کۆمەڵگە توانای خۆگونجانیان هەیە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نوێیەی کە بەرهەمی زیادبوونی مەعریفەی مرۆڤایەتییە بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات کە کۆنترۆڵی ئەو ژینگەیە بکات کە تیایدا دەژی. گەشەپێدانی سیاسیش واتە باش بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی و گۆڕینی کۆمەڵگە بەئاراستەی فراوانبوونی توانای بەشداری لە دروستکردنی بڕیارە گشتییەکان و زیادبوونی ڕۆڵی رای گشتی.

### ٥. پەرەپێدانی سیاسی:

پارتە سیاسییەکان لە گرنگترین هۆکار و ئامرازەکانی پەرەپێدانی سیاسین، بەتایبەت لە سەرەتاکانی پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی کۆمەڵگە. پەرەپێدانی سیاسی پرۆسەیەکی کورتخایەنە، بەڵام گەشەپێدانی سیاسی پرۆسەیەکی درێژخایەنە. پارتی سیاسی لە پرۆسەی پەرەپێدانی سیاسیدا ئامادەسازی دەکات لە بارودۆخێکی دیاریکراو بۆ ئەوەی لەداهاتوودا پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی تیادا ئەنجام بدرێت.

### ٦. گرەنتی دابینکردنی چاودێری گەل:

سیستەمی فرەحزبی گرەنتی چاودێری ئۆپۆزسیۆن دەکات بۆ کاروبارەکانی حکومەت ئەمەش واتە گەل چاودێری کاروبارەکانی دەوڵەت دەکات. کاتێك پارتێکی ئۆپۆزسیۆن چاودێری بەڕێوەچوونی کارەکانی دامەزراوە حکومیەکان دەکات ئەوا دەتوانێت خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئەو حکومەتە دیاریبکات، دواتر ئەو خاڵە لاوازانە بکاتە

پـرۆژەی پارتەکـەی و لـە هەڵمەتـەکانی هەڵبژاردنـدا خاڵـە لاوازەکـانی حکومەت دەربخات، بەمەش گەل لە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی حکومـەت و چۆنێتی بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی ئاگادار دەبێت.

٧. گرەنتی ئاڵوگۆڕکردنی ئاشتیانەی دەسەلات:

فرەحزبی شێوازی ئاشتیانەی گۆڕینی دەسـەلات دیاریـدەکات لـەڕێی هەڵبژاردنـە گـشتییەکانەوە، ئەمـەش ئـاڵوگۆڕکردنێکی شـەرعییانەی دەسـەڵاتە بەشـێوازێکی دیموکراسـیانە. ئـەم شـێوازە پێویـستی بـە ئامادەسـازییەکی گـشتی هەیـە لـەپێناو پێکهاتـەکانی کۆمەڵگـەدا. بەشێوەیەك پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی ئاشتیانەی دەسەلات بە حاڵـەتێکی ئاشتی و یاسایی قبوڵ بکرێت.

٨. دابینکردنی شەرعیەتی سیاسی:

شـەرعیەت واتـە پێکهاتـەی دەسـتووری قبـوڵکراو لـە کۆمەڵگـەدا و ئـەو سەرچاوەیەیە کە حکومەت دەسەڵاتی خۆی لێوە وەردەگرێت. هەنـدێك لە بیرمەندان رۆڵی پارتە سیاسییەکان لە چارەسەری گرفتی شـەرعیەتی سیستەمە سیاسییەکان لە سێ رەهەندا کۆدەکەنەوە:

أ. چـالاکی پارتـەکان لـە گـەورەکردنی شـەرعیەتی سیـستەمی سیاسی لەڕێی کۆکردنەوەی رای جەماوەر.

ب. چالاکی پارتەکان لە دابینکردنی پەیوەندییەکی فراوان لەنێوان پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا.

**ت. ئەو چارەسەرانەی کە پارتە سیاسییەکان پێشنیاری دەکەن لەپێناو چەند ئامانجێکی دیاریکراوی دەسەڵات.**

چەندین شێوەپۆلێنکردنی پارتی سیاسی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها دوو جۆری سەرەکییان باس دەکەین، کە بریتین لە:

- **پۆلێنکردنی دوانی پارتە سیاسییەکان:**

واتە دابەشکردنی بیروبۆچوون و سیاسەتی پارتە سیاسییەکان بەسەر دوو بواری سەرەکیدا. ئەم جۆرە پۆلێنکردنەی پارتە سیاسییەکان چەند جۆرێك لەخۆ دەگرێت. گرنگترینیان دابەشکردنی پارتە سیاسییەکانە بۆ پارتی چەپڕەو و پارتی ڕاستڕەو، پارتی کۆنەپارێز و پارتی پێشکەوتنخواز. پارتی ئاینی و پارتی عەلمانی.

**١. پارتی چەپڕەو و پارتی ڕاستڕەو:**

ئەمجۆرە دابەشکردنە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٨٩)و بۆ یەکەمین ئەنجومەنی نیشتمانی فەڕەنسا، کاتێك ئەو کەسانەی لای ڕاستی سەرۆکی ئەو ئەنجومەنەوە دادەنیشتن شۆرشگێڕە میانڕەوەکان بوون، بۆیە بە ڕاسترەوەکان ناویاندەرکرد. ئەو کەسانەش لەلای چەپی سەرۆکی ئەنجومەنەوە دادەنیشتن شۆرشگێڕە توندرەوەکان بوون، بۆیە پێیان دەوتن چەپڕەوەکان.

بیرمەندی سیاسی ئیتالی (نوربێرتۆ بۆبیۆ) لە ساڵی (١٩٩٤)دا کتێبێکی دەربارەی چەپڕەو و راستڕەو بڵاوکردۆتەوە و تیایدا دەڵێت: (لەڕاستیدا زاراوەی چەپ و ڕاست لە دوو باڵی جەستەوە وەرگیراون، هەرچەندە ئەو شتەی "لەلای ڕاست" یاخود "لەلای چەپ"ە پێدەچێت بگۆڕێت بەڵام هیچ شتێك ناتوانێت هەمانکات لای چەپ و لای ڕاست

بێت. ئەم جیاوازییە لەخۆیدا جۆرێک جەمسەرگەری و ڕیزبەندی لەخۆدەگرێت).

ئەم دابەشکردنە واتە "چەپ و ڕاست" لە زۆربەی وڵاتە دیموکراسییەکاندا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەکاردێت، بەتایبەت لە ئەوروپا. هەرچەندە مەبەستی بەکارهێنان و تێگەیشتن لە چەمکی چەپڕەو و ڕاستڕەو لە کاتێکەوە بۆ کاتێکیتر و لە دەوڵەتێکە بۆ دەوڵەتێکیتر دەگۆڕێت.

ئەو پارتە سیاسییانەی بانگەشەی سوشیالیزم دەکەن و دەیانەوێت دەستێوەردانی دەوڵەت هەبێت لە کاروباری هاووڵاتیان و چالاکییەکانیاندا زیاتر بە پارتە چەپڕەوەکان ناسراون، بەڵام ئەو پارتانەی کە دژایەتی سوشیالیزم دەکەن و دەیانەوێت خاوەندارێتی تاک پارێزراو بێت زیاتر بە پارتە ڕاسترەوەکان ناسراون.

٢. **پارتی کۆنەپارێز و پارتی پێشکەوتنخواز:**

پارتی کۆنەپارێز ئەو پارتە سیاسییانەن کە بیروباوەر و نەریتە کۆنەکان پەسەنددەکەن، لەکاتێکدا دژی هەر بیروباوەڕێکی نوێ دەوەستنەوە. بەڵام پارتە پێشکەوتنخوازەکان لەگەڵ بیروباوەڕی نوێ و تازەگەریدان. لەڕاستیدا دەستنیشانکردنی نوێگەری و کۆنەخوازی حاڵەتێکی ئاسان نیە، چونکە مەرج نیە ئەو هێزەی وەک کۆنەپارێز ناوزەند دەکرێت قبوڵی ئەو سیفەتە بکات، بەهەمان شێوە لە حاڵەتی نوێخوازیشدا. بەڵام ئەوەی دەبێتە پێوەری سەرەکی دیاریکردنی ئاستی کۆنەپارێزی و پێشکەوتنخوازی پارتێکی سیاسی بریتیە لەو پرۆگرامەی ئەو پارتە سیاسییە پەیڕەوی دەکات. ئەمە سەرەڕای

بڕوابوونی بە ئەگەرە کۆن و نوێیەکان لەکاتی پراکتیزەکردنی پرۆسە سیاسییەکاندا.

### ٣. پارتی ئاینی و پارتی عەلمانی:

ئەم دابەشکردنە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا لەسەر زاری خەڵك و رۆژنامە و کەناڵەکانی دیکەی ڕاگەیاندن دەبیسترێت. هەرچەندە ئەم دابەشکردنە لە وڵاتە رۆژئاواییە پێشکەوتووە دیموکراسییەکاندا نیە یان دەگمەنە، بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەدا هەیە کە تائێستا ئایین تیایاندا بەهێز و کاریگەرە. بۆ نمونە لە ئیسرائیل. عێراق. میسر.

پارتە ئایینەکان: ئەو پارتانەن کە دەیانەوێت سیاسەت تێکەڵ بکرێت بە دەقە ئاینییەکانی نێو کتێبە ئاسمانییەکان و پیاوانی ئاینی رۆڵیان هەبێت لە فەرمانڕەواییکردن، هەروەکو ئەو پارتە ئیسلامیانەی لە جیهانی ئیسلامیدا هەن.

بەڵام پارتی عەلمانی: ئەو پارتانەن کە دەیانەوێت ئایین لە دەوڵەت جیابکرێتەوە، دەوڵەت بەپێی یاسا و ڕێسا دانراوەکان بەڕێوە بچێت و دەستتێوەردانی ئایین و پیاوانی ئایینی لە کاروباری دەوڵەت ڕێی لێبگیرێت، سیاسەت و کاری سیاسیش بۆ خەڵکی سیاسی و تەکنۆکرات و لێزان بەجێ بهێڵرێت.

- **پۆلێنکردنی چواری پارتە سیاسییەکان:**

بەپێی پۆلێنکردنی چواری، پارتە سیاسییەکان دەکرێنە بە چوار گروپەوە. چەند تیۆرێك دەربارەی ئەم پۆلێنکردنە هەن، بەڵام لێرەدا ئێمە باسی دوو پۆلێنکردن دەکەین:

**یەکەم: تیۆری ئیزنك:**

(هانس ئیزنك) کە زانایەکی دەروونناسی کۆمەڵایەتی ئینگلیزییە، پێیوایە پارتە سیاسییەکان دابەشبوون بۆ چەپ و ڕاست، بەڵام نە چەپەکان بەهەمان ڕاددە چەپن و نە ڕاستەکانیش بەهەمان ڕاددە ڕاستن، بەڵکو چەپی توندڕەو هەیە و چەپی میانڕەو هەیە، هەروەها ڕاستی توندڕەو هەیە و ڕاستی میانڕەو هەیە. (ئیزنك) ڕاست و چەپ دەکاتە دوو جەمسەری یەك هێڵ و توندڕەو و میانڕەویش دەکاتە دوو جەمسەری هێڵێکی دیکە، بە یەکتربڕینی ئەم دوو هێڵە، پارتە سیاسییەکان دەبن بە چوار بەشەوە کە بریتین لە: "سۆشیالیزمەکان، کۆمۆنیزەکان، پارێزگارەکان، فاشیزمەکان".

**دووەم: تیۆری (لۆیل):**

ئەم تیۆرە جەخت دەکاتەوە لەسەر دەروونی تاکەکان و هەستیان بەرامبەر دیاردەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە دەوڵەتدا. (لۆیل) پێیوایە پارتە سیاسییەکان بەرهەمی کەڵەکەبوونی مەیلی هەموو تاکەکانە بەرامبەر دیاردەی گۆڕان. ئەو وادەبینێت خەڵك هەموویان هاوڕانین و یەك هەڵویستیان نیە بەرامبەر دیاردەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوری لە دەوڵەتدا، هەندێك لە تاکەکان ڕەشبین و هەندێکی دیکەیان گەشبینن بەو پێشکەوتنە، هەروەها سەبارەت بە بارودۆخی لەئارادابوو لە دەوڵەتدا دابەش دەبن بۆ ڕازی و ناڕازی بەو بارودۆخە، واتە دوو تەوەرەی سەرەکی هەیە: یەکێکیان (ڕەشبین-گەشبین) ئەوەی دیکەیان (ڕازی-ناڕازی)، بە یەکتربڕینی ئەم دوو تەوەرە خەڵکی دابەش دەبن بۆ چوار لایەنی سەرەکی کە ئەمانەن:

١. گروپی رازییەکان بە بارودۆخ، گەشبین لە ڕیفۆرم (چاکسازی)، کە لیبراڵەکان پێکدەهێنن.

٢. گروپی رازییەکان بە بارودۆخ، ڕەشبین لە چاکسازی، کە محافزکارەکان پێکدەهێنن.

٣. گروپی ناڕازییەکان بە بارودۆخ، گەشبین لە چاکسازی، کە پێشکەوتنخوازەکان پێکدەهێنن.

٤. گروپی ناڕازییەکان بە بارودۆخ، رەشبین لە چاکسازی، کە کۆنەپارێزەکان پێکدەهێنن.

پارتە سیاسیە دیموکراتەکان لە هەموو شوێنێکی دنیادا بە لانی کەمەوە هەر چوار ساڵ جارێك کۆنگرە دەبەستن. بەشێوەیەکی گشتی بەڕێوەبەری جێبەجێکردن لە پارتەکە کاتەکە دیاری دەکات کە کۆنگرەی تیا دەبەسترێت کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا و لە پەیڕەوی ناوخۆی پارتدا داواکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی پارتەکان لە پەیڕەوە ناوخۆکانیاندا چەند بڕگەیەکیان دیاریکردووە کە ڕێگە دەدات بە ئەندامانی بۆ بەستنی کۆنگرە یان دەنگدان لەنێوان ئاستە جیاوازەکانی پارتی سیاسیدا بۆ بەستنی کۆنگرەکان.

کۆنگرەی پارتی سیاسی دەسەڵاتێکی باڵا دروست دەکات لە پارتدا کە بڕیارە کۆتاییەکان دەردەکات و پشتگیریان لێدەکات. بەتایبەتی لەو بابەتانەی تایبەتە بە سیاسەتی پارتە سیاسییەکەوە لەسەر ئاستی نیشتمانی، یان بەرنامەی پارتەکە، یان پەیڕەوی ناوخۆی پارتەکە، یان لێپرسراوانی پارتەکە.

- **ئامانج لە بەستنی کۆنگرە:**

لەڕاستیدا ئامانج و مەبەستی سەرەکی لە بەستنی کۆنگرەکان بریتییەلە:

١. هەڵبژاردنی سەرکردایەتی پارتی سیاسی و نوێکردنەوەیان.
٢. کاندیدکردنی پاڵێوراوەکانی پارتی سیاسی بۆ هەڵبژاردنە گشتییەکانی وڵات.
٣. هەڵسەنگاندنی بەرنامەی پارتە سیاسییەکە.
٤. هەڵسەنگاندنی پەیڕەوی ناوخۆی پارتە سیاسییەکە.

- **جۆرەکانی کۆنگرەکان:**

بەشێوەیەکی گشتی پەیڕەوی ناوخۆی پارتی سیاسی ئاماژە دەدات بۆ دوو جۆر لە کۆنگرە:

١. کۆنگرە ڕێکخراوەکان (ئاساییەکان): ئەو کۆنگرانەن کە بڕگەی لەسەرهاتوە لە پەیڕەوی ناوخۆدا، کە بەپێی ئەو بڕگانە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و لەماوەی دیاریکراودا کۆنگرە دەبەسترێت لەپێناو گفتوگۆکردنی ئامانجەکان کە لە سەرەوە باسکراوە.

٢. کۆنگرە تایبەتەکان یان جیاکراوەکان: کە بانگەشەی بۆ دەکرێ بۆ گێڕانی لەلایەن کۆمیتەی جێبەجێکردنەوە، یان داوایەك لەلایەن ئەندامانەوە پێشکەش دەکرێت بەو میکانیزمەی کە لە پەیڕەوی ناوخۆی پارتە سیاسییەکاندا دیاریکراوە سەبارەت بە بەستنی کۆنگرەی تایبەت و کتوپڕ لەپێناو گفتوگۆکردنی روداو و بابەتە أستسنائییەکان.

زۆربەی کات کۆنگرە تایبەتەکان یان استسنائیەکان لەکاتێکدا دەبەسترێت کە پارتە سیاسییەکە ڕووبەڕووی کێشەیەك دەبێتەوە یان ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو ڕوودەدات لە گۆڕەپانی سیاسیدا کەوا پێویست دەکات گۆڕانکاری لە سیاسەتی پارتە سیاسییەکەدا بکرێت، یان پێویستی بە ڕێوشوێنێکە بۆ گۆڕانکاریکردن لە ڕێکخستن و پەیڕەوی ناوخۆی پارتە سیاسییەکەدا.

- **لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرە:**

بۆ بەڕێوەبردنی کۆنگرەی پارتە سیاسییەکان سەرکردایەتی هەر پارتێك سەرکردایەتییەکی کارا بۆ بەڕێوەبردنی کۆنگرە هەڵدەبژێرێت

که ئەرکی سەرەکییان بریتیەلە سەرپەرشتیکردنی بەڕێوەبردنی کۆنگرە و کارکردن لەگەڵ خشتەی کارەکان و دیاریکردنی ڕێساکان و ڕێوشوێنەکان. کە بە بەردەوامی لە ئەستۆیان بگرێت و ڕێساکانی بەڕێوەبردنی کۆنگرە پەیرەو بکات.

سەرکردایەتی کارا دەکرێت بە چەند ڕێگەیەك هەڵبژێردرێت، دەستەی بەڕێوەبردن دەتوانێت چەند نوێنەرێك کاندید بکات لەپێناو ئەوەی کە پێشبرکێ بکەن لەسەر پۆستی سەرکردایەتی باڵا بە ڕێگەی هەڵبژاردن. ڕێوشوێنی هەڵبژاردنەکان دوای کردنەوەی کۆنگرە دەست پێدەکات. دەکرێت کارتی خۆکاندیدکردن بنێردرێت بۆ نوێنەران بۆ ئەو پۆستە لەپێناو خۆکاندیدکردنی ئەو کەسانەی دەیانەوێت ببنە بەڕێوەبەری کۆنگرەکان بۆ سەرکردایەتی باڵا کە دواتر دەنگدان لەسەری دەستپێدەکات ڕاستەوخۆ لەدوای کردنەوەی کۆنگرە و دواتر سەرۆکی پارتەکە دەستپێکردنی کردنەوەی دانیشتنی کۆنگرە ڕادەگەیەنێت و بانگهێشتی کاندیدکراوەکان ئەکات بۆ سەرکردایەتی باڵا و دەنگدانی ئەندامانی کۆنگرە بۆ هەڵبژاردنی لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرە دەکرێت. وا باوە مەرجی سەرەکی ئەوانەی دەبنە ئەندام لە لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرە نابێ بە هیچ جۆرێك خۆیان بۆ ئەو هەڵبژاردنانە بپاڵێون کە لەنێو کۆنگرەدا بەڕێوەدەچێ، وەك هەڵبژاردنی سەرکردایەتی و هەڵبژاردنی سەرۆکی پارت.

دەگونجێت لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرە پێك بێت لە حەوت کەس کە هەندێکیان وەك گروپ کاردەکەن و لەژێر دەسەڵاتیاندا چەندین کەس و گروپیتر کاردەکەن. بەڵام بۆ بەڕێوەبردنی زۆربەی کۆنگرەکان گروپێکی حەوت کەسی پێویستە کە بریتین لە:

١. سەرۆك:

ئەو کەسەیە کە لەڕووی ئیدارییەوە بڕیاری کۆتایی سەرجەم کاروبارەکان لە ئەستۆیدایە و سەرۆکایەتی هەموو کۆبوونەوە سەرەکیەکانی نێو کۆنگرە دەکات. بەشێوەیەکی گشتی سەرۆکی لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرەیە. سەرۆك دەتوانێت بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات بۆ زۆر لە بابەتە ئیدارییەکان و دەبێ ئەندامانی کۆنگرە پەیڕەوی بکەن چونکە خۆیان هەڵیانبژاردووە.

٢. سێ جێگر بۆ سەرۆك:

ئەو کەسانەن کە لەکاتی کۆبوونەوە بچووکەکان و کاری گروپدا سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکان دەکەن و هەمان دەسەلاتی سەرۆکی لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆنگرەیان هەیە لەنێو ئەو گروپانەدا.

٣. لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە:

ئامانج لە دروستبوونی لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە بریتیەلە گرەنتیکردنی باش بەڕێوەبردنی کۆنگرەکە کە هاوشێوەیە لەگەڵ ئەوەی لە پەیڕەوی ناوخۆی پارتەکەدا هاتوە. لەڕاستیدا پێویستە بەڕێوەچوونی کۆنگرە هاوتا بێت لەگەڵ ڕێسا جێبەجێکراوەکان کە لە یاسای پارتە سیاسیەکاندا هاتوە.

کاری یەکەمی لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە بریتیەلە چاودێریکردنی تۆماری نوێنەران و پێشکەشکردنی ڕاپۆرتەکەی لەبارەی ژمارەی نوێنەرە ئامادەبوەکان لە کۆنگرەدا. لێرەدا پێویستە دڵنیا ببێتەوە لە ڕاستی ڕێژەکە لەپێناو ئەوەی زۆربەی کات

دروستبونی یەك لە سەر سێی ژمارەی نوێنەرە ئامادەبوەکان بڕیارەکانی کۆنگرە جێبەجێ دەکات.

دواتر لیژنەکە هەڵدەستێت بە چاودێریکردنی کارەکانی کۆنگرەکە و جەخت دەکاتەوە لە پەیڕەوکردنی پەیڕەوی ناوخۆ و ڕێساکانی پارتی سیاسی لەگەڵ بەرەوپێشچونی کۆنگرەدا هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوە و وەرگرتنی هەموو ئەو سکاڵا و شکاتانەی کە پێشکەش دەکرێت لەلایەن نوێنەرە ئامادەبوەکانەوە. وەك چۆن لیژنەکە هەڵدەستێت بە دڵنیابوونەوە لەو دەرەنجامانەی کە لەلایەن لیژنەی هەڵبژاردنەوە دەردەچێت.

لەڕاستیدا لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە پێویستە بوونی هەبێت لە سەرەتای کۆنگرەدا لەبەر ئەوە پێویستە ئەندامەکانی پێش کۆنگرەکە دیاری بکرێت. هەندێك لە پارتەکان هەڵدەستن بە هەڵبژاردنی لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە و دواتر لە کۆتایی کۆنگرەکەدا لیژنەیەکیتر هەڵدەبژێرن لەپێناو ئەوەی کە ئامادەبێت بۆ کۆنگرەی داهاتوو. دەکرێت دەستەی سەرۆکایەتی یان ئەنجومەنی سەرکردایەتی پارتەکە هەڵدەستێت بە دامەزراندنی لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە پێش بەستنی کۆنگرەکە. ئەندامانی لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوەش هاوشێوەی لیژنەکانیتر مافی خۆ کاندیدکردنیان نیە بۆ ئەو پۆستانەی کە لەماوەی کۆنگرەکەدا دەرگای خۆپاڵاوتنیان بۆ دەکرێتەوە.

٤. **لیژنەی هەڵبژاردن:**

لیژنـــەی هەڵبـــژاردن لێپرســـراوە بەرامبـــەر هـــەموو لایەنـــە پەیوەندیـدارەکان بەهـەر هەڵبـژاردنێك کە بکرێـت لـەماوەی کـۆنگرەدا. پێویستە لیژنەکە هەستێت بە ئامادەکردنی هـەموو مـاددە پێویستەکان و کۆکردنەوەی هەموو کاندیدەکان لەماوەی کۆنگرەدا ئەگەر کرا، ئەمە سەرەڕای کۆکردنەوەی شێوەی پێشنیارەکان، تەفسیر و ڕونکردنەوەی ڕێوشـوێنەکانی دەنگـدان، جیاکردنـەوەی دەنگـەکان، پێـشکەشکردنی ئەنجامەکان بە لیژنەی لێکۆڵینەوە و پێداچونەوە و کۆنگرە.

ســەرۆکی لیژنــەی هەڵبــژاردن لەهــەمان کاتــدا هەڵدەبــژێردرێت کــە ســەرکردایەتی کــارای تێــدا هەڵبــژێردرا. بــەلاّم ئەنــدامانی لیژنەکــە دادەمـــەزرێن و دیـــاری دەکـــرێن بـــە پـــشتبەستن بـــە توانـــا و لێهاتووییەکانیان. ژمارەی ئەو نوێنەرانـەی کە نەخشەی بۆ کێشراوە ئامـادەبن لـە کـۆنگرەدا دیـاری دەکرێـت لەلایـەن ئەنـدامانی لیژنــەی هەڵبژاردنەوە. ئەندامانی لیژنەی هەڵبـژاردن مـافی خۆکاندیـدکرنیان نیـە بۆ هەر پۆستێك لەماوەی کۆنگرەدا.

٥. **سکرتاریەت:**

کەسێکە یان چەند کەسێکن هەڵدەستن بە نووسینەوەی هـەموو ئـەو ڕووداو و حاڵەتانـەی لەنێو کۆنگرەدا ڕوودەدەن و چۆنێتی دەنگـدان و پەسـەندکردنی برگـەکانی نێـو پـەیڕەوی نـاوخۆ و بەرنامـەی ئـەو پارتـە سیاســییە. مەبەســتی ســەرەکی ئەمــەش بریتیەلــە بــەراوردکردنی دەرەنجامــەکان و دەرخــستنی ئــەو گۆڕانکاریيانــەی لــە ئــەنجامی کۆنگرەکەوە بەدیهاتوون.

* **چەمکی جیهانی سێیەم:**

دەستەواژەی جیهانی سێیەم بۆ یەکەمجار لەساڵی (١٩٥٦) لەدوای کۆتاییهاتنی کۆنگرەی (ئەفرۆ-ئاسیایی) لە (باندۆنگ) بەکارهات، کاتێك کتێبی (جیهانی سێیەم: دواکەوتن و گەشەسەندن) لەلایەن کۆمەڵێك لەبیرمەندانەوە دەرچوو بە سەرپەرشتی بیرمەندی فەرەنسی (جۆرج بالاندیە).

پێشەکی ئەم کتێبە لەلایەن بیرمەندی ناسراو (ئەلفرێد سۆڤی) بیرمەندی بواری لێکۆڵینەوەی مرۆیی و دانیشتوانەوە نووسرایەوە. (سۆفی) دەستەواژەی جیهانی سێیەمی بەکارهێنا وەك هاوشێوەیەك بۆ دەستەواژەی (چینی سێیەم) کە لە کۆمەڵگەی فەرەنسیدا لە پێش شۆڕشی ساڵی (١٧٨٩) هەبوو.

(سۆفی) هەوڵ دەدات ڕەهەندێکی مێژوویی بدات بەو چەمکە، بە بۆچونی ئەو جیهانی سێیەم، سێیەم کۆمەڵەی دەوڵەتانی جیهانە کە بەپێی ڕیزبەندێکی مێژوویی سەریهەڵداوە. هەروەك یەکەمجار کۆمەڵەی ئەو وڵاتانە سەریهەڵدا کە پێیان دەگوترێت (وڵاتانی پێشکەوتوو یان وڵاتانی سەرمایەداری) کۆمەڵەی دووەمیش ئەو وڵاتانەن کە بە (وڵاتانی سۆشیالیستی پێشکەوتوو) دەناسرێن، بەڵام کۆمەڵەی سێیەم کە (ئەلفرێد سۆفی) ناوی ناوە جیهانی سێیەم واتە ئەو وڵاتانەی کە سەربەخۆییان لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە وەرگرتووە لە هەریەك لە وڵاتانی کیشوەرەکانی (ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریکای لاتین).

هەندێ بیرمەندی تر لەسەر بناغەی جوگرافی وڵاتانی هەر سێ کیشوەری (ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریکای لاتین)یان ناونـاوە جیهانی سێیەم، بەڵام ئەم بنەما جوگرافیە سەرکەوتوو نەبوو. هەندێك لە بیرمەندانی (مارکسی) لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان کە نابێت ئەو وڵاتانەی لەژێر هەژمونی (هەیمەنە)ی ئیمپریالی ڕزگاریان بوە و لە کیشوەرەکانی (ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین)ن بە جیهانی سێیەم ئەژمار بکرێن وەك وڵاتانی نیمچەدورگەی هیندی چینی (ڤێتنام، لاوس، کمبۆدیا، کۆریای باکور، کوبا، ئەلبانیا، چین).

بیرمەند (پییێر گالیە) نوسەری کتێبی (بەتاڵانبردنی جیهانی سێیەم) پێی وایە دەستەواژەی جیهانی سێیەم وڵاتانی ئەمریکای لاتین جگە لە (کوبا) و سەرجەم وڵاتانی ئەفەریقیا و ئاسیا. جگە لە وڵاتانی (کۆمۆنیستی و یابان)، دەگرێتەوە.

بەپێی ئەم بۆچوونە بۆمان دەردەکەوێ کە بیرمەند (پییێر گالیە) لایەنگری ئەو بۆچوونە دەکات کە پێی وایە (چەمکی جیهانی سێیەم) (چەمکێکی سیاسی)یە بە پلەی یەکەم لەوەی کە چەمکێکی ئابوری-فەرهەنگی-کۆمەڵایەتی بێت. بەو مانایەی ئەو کۆمەڵە دەوڵەتە دەگرێتەوە کە لە وڵاتانی سەرمایەداری و سۆشیالیستی جیاوازن. ئەم بۆچوونەش لەلایەن بیرمەند (جۆن ماڵیگۆن) لە فەرهەنگە سیاسیەکەیدا پشتڕاست کراوەتەوە کە بەم شێوەیە پێناسەی جیهانی سێیەم دەکات: (ئەو کۆمەڵە نەتەوەیەن کە کەوتونەتە نێوان وڵاتانی سۆشیالیستی و وڵاتانی ئازاد- سەرمایەداری). ئەم بۆچوونانە وامان لێدەکات کە بڵێین چەمکی جیهانی سێیەم زیاتر ڕەهەندێکی سیاسی وەردەگرێت. بەڵام ئەمە واتە جەختکردن لەسەر لایەنی نێگەتیف (سلبی) بەو پێیەی خاڵە

سلبیەکانی جیهانی سێیەم لە جیهانی سەرمایەداری و جیهانی سۆشیالیستی جیادەکاتەوە.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی جیهانی سێیەم واتە: ئەو جیهانەی کە تایبەتمەندی سەرەکی تیایدا بریتیەلە دواکەوتن (التخلف) و بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان بەرەو پرۆسەی گەشەپێدان هەنگاو بنێن.

هەر لە پێناسەکردنی جیهانی سێیەمەوە لەلایەن ئەو بیرمەندانەی کە بۆ یەکەمجار ئەم چەمکەیان بەکارهێناوە، بۆمان دەردەکەوێت کە سنوری جوگرافی ئەم جیهانە لە هەریەك لە کیشوەرەکانی (ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین) دیاری دەکرێت. بەم پێیە جیهانی سێیەم ولاتانی باشوری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەموو ئەفریقیا و سەرجەم ولاتانی کیشوەری ئاسیا جگە لە (چین و یابان)، هەروەها دورگەکانی زەریای هێمن جگە لە (ئوسترالیا و نیوزلەندا) دەگرێتەوە.

لەرووی جیۆپۆلەتیکەوە ئەم ناوچەیە خاوەنی داهات و بەروبوم و سامانێکی سروشتی ئێجگار فراوانە، لە سەرووی هەموو ئەمانە سامانی نەوت دێت کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وەك چەکێکی ئابوری-سیاسی بەکارهاتووە. لەگەڵ بوونی ئەم سەرچاوە سروشتیانە عەقڵیەتی کاربەدەستانی ولاتانی جیهانی سێیەم ڕۆڵێکی نێگەتیڤانەی بینیوە لە شێوازی سوود وەرگرتن و وەبەرهێنانی ئەو داهات و سەرچاوە سروشتیانە، بۆ نمونە ئەگەر باس لە سامانی نەوت بکەین دەبینین لە سەرجەم ئەو ولاتانەی جیهانی سێیەم کە نەوت تیایاندا بڕبڕەی پشتی ئابوری ولاتە، ئەم سەرمایەیە لەپێناو کۆمەڵێك ئامانجدا بەکارهێنراوە کە نەیتوانیوە خزمەت بە پرۆسەی گەشەپێدان لەو ولاتانەدا بکات، لەوەش زیاتر رۆژ لەدوای رۆژ ئەو ولاتانەی بەرەو

دواکەوتن بردووە، واتە ئاراستەی دەرەنجامەکانی پێچەوانە بوەتەوە. ئەمەش کاریگەری لە سەرجەم بوارەکانی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و تەکنەلۆژی و.....هتد دروست کردووە.

زۆربەی لێکۆڵینەوە زانستیەکان جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوە کە بەرهەمهێنانی سامانی نەوت لە جیهانی سێیەم بە تێکڕای (٧٨ ملیۆن بەرمیل)ی ڕۆژانە بوە لە ساڵی (١٩٩٥)، بەڵام پێشبینی دەکرێت ئەو ڕێژەیە لە ساڵی (٢٠١٥)دا بگاتە (١٤٠ ملیۆن) بەرمیل لە ڕۆژێکدا. هەروەها ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییانەی کە لە وڵاتە پێشکەوتوەکانی ناسراو بە وڵاتانی تەکنۆلۆژی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەورووپا و یابان) روودەدات پێویستی زیاتری وەبەرهێنانی نەوت دێنێتەکایەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییانەی لە سەرانسەری جیهاندا روودەدات پێویستی بە نەوت و پێکهێنەرەکانیەتی بە پلەی یەکەم، کەواتە تا ئاسۆی داهاتوش پێویستی وەبەرهێنانی نەوت و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی کێڵگەی نەوتی نوێ بەردەوام دەبێت.

ئەوەی جێی سەرنجە لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٠)دا چەند لێکۆڵینەوەیەك ئاشکرایان کرد کە وڵاتی (عەرەبستانی سعودی) خاوەنی گەورەترین یەدەگی نەوتە لە جیهاندا و لە ساڵی ٢١٠٠ ئەو یەدەگەی سعودیە کۆتایی دێت، دوای ئەویش (عێراق) لە پلەی دووەمدایە، بەڵام دواتر لە مانگی ئابی (٢٠٠٢)دا چەند لێکۆڵینەوەیەکی نوێ ئەوەیان بڵاوکردەوە کە عێراق خاوەنی یەکەمین یەدەگی نەوتە لە جیهاندا بەشێوەیەك تاساڵی (٢١٢٥) بەردەوام دەبێت

و دوای ئەویش (عەرەبستانی سعودی) دێت کە یەدەگی نەوتی تیایدا تا ساڵی (٢١٠٠) بەردەوام دەبێت.

لەلایەکی ترەوە چەند لێکۆڵینەوەیەك گەیشتونەتە ئەو دەرەنجامەی کە لە سەدەی بیست و یەکدا بەشێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم جۆرێك لە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان بەخۆیانەوە دەبینن کە کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسەر سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی ئەو وڵاتانەی ئەم حاڵەتە دەیانگرێتەوە. بۆ نموونە وڵاتی (میسر) هەموو (٢٥) ساڵێك ژمارەی دانیشتوانی دەبێتە دوو ئەوەندە. ئەم زیادبوونی دانیشتوانەش بەبۆچوونی هەندێك لەبیرمەندانی رۆژئاوا رۆڵێکی سەرەکی هەیە لەسەر سەرهەڵدانی توندوتیژی و توندڕەوی سیاسی.

کەواتە لە ڕووی جیۆپۆلەتیکەوە جیهانی سێیەم گرنگییەکی فراوان و کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەیە لەسەر سەرجەم بارودۆخی ئەم ناوچەیە و بەشی زۆری ئەم گرنگییەش بەپێی کات و شوێن گۆڕانکاری بەسەرداهاتوە، بەڵام هەمیشە ئەم هاوکێشەیەی بەسەردا جێبەجێ بوە: {گرنگی بەردەوام، جیاواز بەپێی شوێن}.

- **قەیرانەکانی جیهانی سێیەم:**

جیهانی سێیەم جیهانێکی ناسراوە بە چەندین قەیران و گرفتی یەك لەدوای یەك کە سەرجەم بوارەکانی ژیانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و تەکنەلۆژی و ..هتد گرتۆتەوە، ئەم قەیرانانەش بەشێوەیەکی گشتی کاریگەرییان لەسەر رەوشی سیاسەت و ژیانی سیاسی و سیستەمە سیاسیەکان بەجێ هێشتووە. لەم جیهانەدا پارتە سیاسییەکان تا ئاستێکی بەرچاو بونیان نیە. یان

ئەگەر بوونیشیان هەبێت ئەوا لە چوارچێوەی سیستەمێکی تاک حزبدا فەرمانڕەوایی دەکەن. ئەم سیستەمەش بوەتەمایەی سەرهەڵدانی چەندین قەیران لە جیهانی سێیەمدا. لەگرنگترین ئەو قەیرانانەش:

**یەکەم: قەیرانی شوناس (ناسنامە):**

یەکێکە لەو قەیرانە سەرەکیانەی کە لە جیهانی سێیەمدا بوونی هەیە و رۆڵێکی کاریگەر دەگێرێت لە دواکەوتنی سیاسی بەشێوەیەك پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان تاکەکان و کۆمەڵ ناهێڵێت و ناکۆکی و جیاوازی دروست دەکات بەمەبەستی لەباربردنی هەوڵەکان بەئاراستەی پرۆسەی گەشەپێدان، ئەم قەیرانە دەربڕی نەبوونی هزری هاوولاتیبوونە لەنێوان کۆمەڵە پێکهاتەکانی ناو کۆمەڵگە، بەشێوەیەك تاکەکانی کۆمەڵگە لە جیهانی سێیەمدا لە پێکهێنەرەکانی شوناسی خۆیان دەست هەڵدەگرن و هەوڵ دەدەن پێکهێنەری ناسنامەی نەتەوە پێشکەوتووەکان وەرگرن.

لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا قەیرانی ناسنامە لە چەند روویەکەوە سەریهەڵداوە لەوانە:

١. **جیاوازی نەژادی (رەگەزی-عرقی):**

زۆرینەی کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەم فرە نەژادن ئەمەش هەستێکی لای تاکەکان دروست کردووە کە ناتوانن پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان رەگەزەکەیان و رەگەزەکانی تری ناو کۆمەڵگە دروست بکەن، هەر ئەمەش لە زۆر حاڵەتدا وای کردووە کە ئەم گروپە رەگەزیانە

داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە رەگەزەکانی تر بکەن، ئەمەش لە ئەنجامدا لە زۆرێك لە ولاتانی جیهانی سێیەم پشێوی و نائارامی سیاسی بەرهەم هێناوە.

لەرێی وتوویژ و کۆنگرە و کۆبوونەکانەوە هەوڵدراوە کاریگەرییە سلبیەکانی جیاوازی رەگەزی کەم بکرێتەوە، بۆ نموونە (کۆنگرەی دژە رەگەزپەرستی؛ لەباشوری ئەفریقیا لەشاری (جوهانس بێرگ) لەساڵی ۲۰۰۰؛ بەسترا کە تیایدا تاوتوێی گرنگترین ئەو لایەن و هۆکارانە کرا کە بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی هەزری رەگەزپەرستی و لەکۆتایشدا پەیماننامەیەك لەنێوان دەوڵەتانی بەشداربوو ئیمزا کرا لەسەر وەستان لەدژی هەموو جۆرەکانی رەگەزپەرستی.

لەگرنگترین ئەو حاڵەتانەی کە لە جیهانی سێیەمدا هەیە و تیایدا رەگەزەکان داوای جیابوونەوە دەکەن وەك (دارفۆر ، پۆلیساریۆ ، تامیل ، ئەمازیغییەکان ، کورد ..هتد).

۲. **جیاوازی چینایەتی:**

بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەمدا تاکەکان بەسەر دوو چیندا دابەش بوون، چینێکیان دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوایە کە بەهەر هۆکارێك بێت گەیشتۆتە دەسەڵات و (ممارەسە) پراکتیزەی دەکات بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو، چینی دووەمیش جێبەجێکاری فەرمانەکانی چینی یەکەمن و تەنها ملکەچی و گوێ رایەڵیان پێ دەبڕێت لە بەرامبەر وەرگرتنی مافی ژیان، لادانیش لەم ملکەچیە ئەنجامەکەی لێ سەندنەوەی ئەو مافەیە.

٣. دواکەوتنی ئابوری و شارستانی:

ئەو سیستمە ئابورییە دواکەوتوویانەی وڵاتانی جیهانی سێیەم پێوەی دەناڵێنن بوەتەهۆی سەرهەڵدانی قەیرانی جۆراوجۆر، لەگەڵ ئەمەشدا شارستانیەت و ژیاری نەتەوەکان تارادەیەکی زۆر بەهۆی هەندێك داب و نەریتی دواکەوتوانەوە بۆتە شارستانیەتێك کە ناتوانێت خواستی تاکەکانی کۆمەڵگا بەدیبهێنێ، خۆبەستنەوە بە مێژوو و بانگەشەکردن بۆ ژیان لەسەر بناغەی ژیانی باوپاپیران هۆکارێکە بۆ نەگونجاندنی شارستانیەتی پێشوو لەگەڵ ژیانی نوێی خەڵك لەسەردەمی جیهانگیریدا.

دووەم: قەیرانی شەرعیەت:

کرۆکی شەرعیەتی دەسەلات واتە ڕەزامەندبوونی هاووڵاتیان بەو دەسەلاتە، لەم بارەیەوە بیرمەندی ئەڵمانی (ماکس ڤێبەر) پێی وایە دەسەلاتی سیاسی لەیەکێك لەم سێ سەرچاوەیەوە شەرعیەت وەردەگرێ:

١. دابونەریت:

سەرچاوەی سەرەکی وەرگرتنی شەرعیەتە لە سیستەمە ئۆتۆکراتیەکان وەك (ئوردن، مەغریب، عەرەبستانی سعودی، سوریا، بانگلادیش، بەشێکی زۆری وڵاتانی ئەفریقیا... هتد).

٢. کەسێتی سەرکردە (سەرکردەی کاریزما):

کاریزما کەسایەتیەکە کە هەستی بە سەرجەم نەهامەتی و هیواکانی کۆمەڵ کردووە، هەڵسوکەوتی دەربڕی یان ڕەنگدانەوەی ڕۆحی خەڵکە، هێزێکی شۆڕشگێرە کە بەها و ڕەفتاری نوێ دەداتە کۆمەڵ بەتایبەت لەو کاتانەی کە گەل بە قەیرانەکاندا تێپەڕدەبێت، لە هزری (تیروانین) گەلەوە کاریزما سەرکردەیەکە بە کەسێکی بەهێز و دانا و خاوەن خاسیەتی سەرسوڕهێنەر دەوترێت کە خەڵکی ئاسایی ئەو سیفەتانەی نییە تەنها ئەو دەتوانێت گەل بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکانی ببات. هەروەها هەر ئەویشە گەل لە نەهامەتی و قەیرانەکان رزگار دەکات بەواتایەکی تر دەسەڵاتی نزیکە لەدەسەڵاتی خواوەند، بە مانایەکی دیکە دەبێتە سەرکردەیەکی پێویست بۆ رزگارکردنی میللەت.

لە گرنگترین ئەو کەسانەش کە لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا وەك کاریزما سەیرکراون: (ماندێلا، گیڤارا، کەمال ئەتاتورك، کاسترۆ، خومەینی، جەمال عەبدولناسر، سەدام حوسێن، سۆکارتۆ، بیرۆن، نیکرۆما،... هتد).

٣. دەستوور:

ئەو دەسەڵاتانەی شەرعیەتیان لە دەستورەوە وەردەگرن بە دەسەڵاتێکی سەرکەوتوو لە قەڵەم دەدرێن، لەم دەسەڵاتەدا فەرمانڕەوا و سەرکردە تەنها فەرمانبەرن و دەسەلات بەڕێوە دەبەن خاوەنی سەرەکی دەسەڵاتیش بریتیە لە دەوڵەت. نمونەی ئەم حاڵەتەش لە وڵاتانی

جیهانی سێیەمدا، دەگمەنە بەڵام لەهەندێ شوێنی وەك (ئیسرائیل، تورکیا، فلیپین، ئەندەنوسیا) چەند حاڵەتێکی دەگمەنی تر هەیە.

زۆربەی دامەزراوە سیاسیەکانی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم شەرعیەتیان نییە و ئەو دەسەلاتانەشی کە ئەم ولاتانە بەرێوە دەبەن درێژکراوەی ئەو یەکە ئیداریانەیە کە لەلایەن داگیرکەرانەوە دروست کراون، کەواتە قەیرانی شەرعیەت یەکێکە لەگرنگترین ئەو قەیرانانەی کە جیهانی سێیەمی گرتۆتەوە.

**سێیەم: قەیرانی بەشداری سیاسی:**

بەشێکی زۆر لە بیرمەندان پێیان وایە گرنگترین جیاوازی نێوان کۆمەڵگەی پێشکەوتوو کۆمەڵگەی دواکەوتوو بریتیەلە بوونی بەشداری سیاسی.

بەدەیان بیرمەند لەبارەی چەمکی بەشداری سیاسیەوە لێکۆڵینەوە و بۆچوونەکانیان خستۆتەڕوو بۆ نموونە (سامۆئیل هنتنگتۆن) پێی وایە (بەشداری سیاسی جۆرێکە لە چالاکی سیاسی کە هاوڵاتیانی ئاسایی ئەنجامی دەدەن بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکانی حکومەت).

هەروەها بیرمەند (مایرۆم وینتەر *Myrom Wienter*) پێی وایە (بەشداری سیاسی کۆمەڵێك ڕەفتاری ئیداریە مەبەست لێی دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر پرۆسەی سیاسەتی گشتی و بەرێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگە هەروەها لەم ڕێگەیەوە سەرکردەکان هەڵدەبژێردرێن بۆ ئاستەکانی حکومەت).

- بەشێوەیەکی گشتی بەشداری سیاسی پێویستە چەند لایەنێك لەخۆبگرێت، واتە کۆمەڵێك ڕەفتار هەن کە وەك بەشداری سیاسی ئەژمار دەکرێت، کە ئەوانیش بریتین لە:

١. کۆمەڵە ڕەفتارێك کە لەرێگەیەوە جەماوەر داخوازییەکانیان پێشکەش بە دەستەبژێری (نوخبە)ی فەرمانڕەوا دەکەن، هەروەها ئەم داخوازیانەش کە جەماوەر پاڵپشتی فەرمانڕەوای پێ دەکەن.

٢. ئەو هەولانەی کە جەماوەر دەیدات بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر ڕەفتاری فەرمانڕەواکان. لە گرنگترین ئەو ڕەفتارانەش (پرۆسەی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا، فشار خستنەسەر دەستەبژێری فەرمانڕەوا، خۆپیشاندان، ئیمزا کۆکردنەوە لەسەر بابەتێك و پێشکەشکردنی بە دەسەلات)، هەروەها هەر هەولێکی تر کە بەپێی یاسا ڕێپێدراو بێت.

٣. پرۆسەی نوێنەرایەتیکردنی پەرلەمانی، ئەمەش زیاتر لە کۆمەڵگە سەردەمیەکاندا دەبینرێت کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە و هەموو خەڵك ناتوانن ممارەسەی راستەوخۆی دەسەلات بکەن و لەرێی هەڵبژاردنەکانەوە چەند نوێنەرێك بۆ خۆیان دیاری دەکەن.

٤. بەشداربوون لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا، بوون بەئەندام لە پارتە سیاسیەکاندا، بوون بەئەندام لە گروپی فشار، تەرخانکردنی بەشێك لە کاتەکان بۆ بابەتە گشتیەکان.

٥. هەوڵدان بۆ گۆڕینی واقیعی سیاسی کۆمەڵگە.

٦. نووسـینی پـەرتوك و بڵاوكردنـەوەی بابـەت لـە گۆڤـار و ڕۆژنامەكاندا بە تایبەت ئەو بابەتانەی كە پەیوەندی بە ژیانی گشتی خەڵكەوە هەیە.

٧. خوێندنـەوەی پـەرتوك و ڕۆژنامـە و گۆڤارەكـان و گـوێگرتن لـەو لێكدانـەوە و پرۆگرامانـەی رادیـۆ و تەلـەفزیۆن و ئاژانسەكانی هـەواڵ بـڵاوی دەكەنـەوە بەتایبـەت ئەوانـەی پەیوەنـدیان بـە ژیـانی سیاسـی و ئیداری و ئابووری كۆمەڵگەوە هەیە.

٨. هەندێك لە بیرمەندان پێیان وایە گۆشەگیربوون یان دابڕان (العزلة) ئەگەر مەبەست لێی ڕەتكردنەوەی واقعی سیاسی كۆمەڵگە بێت ئـەوا دەگونجێت بەشێوازێك لە شێوارەكانی بەشداری سیاسی دابنرێت.

قـەیرانی بەشـداری سیاسـی یەكێكـە لـە گـرنگترین و سـەرەكیترین قەیرانـەكانی جیهـانی سـێیەم كـە خـۆی لـە قـۆرخكردنی دەسـەڵات دەبینێتـەوە پاشـان سیـستەمێكی دیكتـاتۆری لێ دروسـت دەبێـت كـە چەندین ئاستەنگ دەخاتە بەردەم بەشداری جەماوەر لە ژیانی سیاسیدا و هـەموو چـالاكیەكانی جـەماوەر بـۆ بەدەسـتهێنانی مـافی بەشـداری سیاسـی بـە هەڵـسوكەوتی ناشـەرعی و نایاسـایی لـە قەڵـەم دەدرێـت لەبەرئەوە دەستەبژێری فەرمانڕەوا لە وڵاتـانی جیهـانی سێیەمدا پێیـان وایە تەنها ئەوان خاوەنی مافی فەرمانڕەوایەتین بەپێی ئەو مێژووەی كە هەیانە لە شۆڕش و خەبات لە قۆنـاغی پـێش سـەربەخۆیی هـەروەك ئـەو دەستەبژێرانە ڕایدەگەیێنن (لەبەرئـەوەی ئێمـە ووڵاتمـان لـەژێر دەسـتی داگیركەر رزگار كردووە هەر بۆیە وڵات موڵكی تایبەتی خۆمانە و بۆمان هەیە هەڵسوكەوتی پێوە بكەین).

ئەم جۆرە بیروبۆچوونانە وای کرد کە زۆربەی فەرمانڕەواکان لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا قەدەغەی سەرهەڵدانی پارتە سیاسیەکان و ڕێکخراوە ناحکومیەکان بکەن، پاشان وڵات بەرەو سیستمی تاك حزبی سەپێندراو و ئاراستەکراو برد، تاك حزبیش سەرجەم لایەنەکانی ژیانی سیاسی و دامەزراوەکانی دەوڵەتی قۆرخ کرد، ئەمەش هەمووی لە دەسەڵاتی سەرکردەدا خۆی دەبینیەوە کە لە هەمان کاتدا سەرکردەی تاك حزب و سەرکردەی وڵاتیش بوو. بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٦٥) لە (زائیر) واتە (مۆبۆتۆ سیسیکۆ) لەڕێی کودەتایەکی سەربازییەوە گەیشتە دەسەڵات و لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵات سەرجەم پارتە سیاسیەکانی ڕەتکردەوە و وڵات بەبێ پارت مایەوە تا ساڵی (١٩٧٠) کاتێك (مۆبۆتۆ سیسیکۆ) (پارتی بزوتنەوەی گەل) دروستکرد و ژیانێکی تاك حزبی بەسەر (زائیر)دا سەپاند تا ساڵی (١٩٩٧) کاتێك لەڕێی پرۆسەیەکی سەربازیەوە (لۆران کابێلا) کۆتایی بە دەسەڵاتەکانی (مۆبۆتۆ) هێنا و وڵاتی بەرەو دیموکراسی برد تەنانەت ناوی وڵاتەکەی لە (زائیر)ەوە کرد بە (کۆنگۆی دیموکرات).

هەروەها چەندین نموونەی تر هەن کە دەسەڵاتی تاك حزبییان لە وڵاتدا پەیڕەو کردووە بۆ نموونە (میسر) لە سەردەمی (جەمال عەبدولناسر)، (عێراق) لە سەردەمی (ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حسێن)، (سوریا) لە سەردەمی (حافز ئەسەدو بەشار ئەسەد)، (زامبیا) لە سەردەمی (کاوندا)، (ئەندۆنیسیا) لە سەردەمی (سۆکارنۆ و سۆهارتۆ)، (نیکاراگوا) لە سەردەمی (آل سۆموزا)، (ئەرجەنتین) لە سەردەمی (بیرۆن)...هتد.

• لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانی بەشداری سیاسی لە وڵاتانی جیهانی سێیەم:

**١. بەرزبوونەوەی ڕێژەی نەخوێندەواری لەناو دانیشتوانی وڵاتانی جیهانی سێیەم؛**

بۆ نمونە بەپێی ئامارەکانی (بانکی نێودەوڵەتی) لە ساڵی (١٩٩٠) لە (پاکستان ٦٥٪، سۆماڵ ٧٦٪، میسر ٥٢٪) دانیشتوانیان نەخوێندەوار بوون. بەم جۆرە نەخوێندەواری و بەرزبوونەوەی ڕێژەکەی دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی ڕاددەی بەشداری سیاسی بەومانایەی نەخوێندەواری واتە هەوڵنەدانی تاکەکانی کۆمەڵ بۆ خوێندنەوە و نووسین و ئاگاداربوون لە بەرەوپێشچوونەکانی جیهان هەروەکو دەبینین بەردەوام خەڵکانی نەخوێندەوار ملکەچ و گوێ ڕایەڵێکی بێ ڕۆڵن بۆ دەسەڵاتی سیاسی.

**٢. هەژاری؛**

یەکێکە لە سەرەکیترین کێشە و گیروگرفتەکانی زۆرینەی وڵاتانی جیهان و جیهانی سێیەم و لە هەندێ شوێنیش ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبوونێکی بێ وێنەدایە، بۆ نمونە (ناوەندی داهاتی تاك) (متوسط دخل الفرد) لە (مۆزەمبیق) بەپێی ئامارەکانی (بانکی نێودەوڵەتی) لەساڵی (١٩٩٢) بریتیە لە (٨٠$) لە (بەنگلادیش ٢١٠$) لە (پاکستان ٣٨٠$) لە (میسر ٦٠٠$)، لەبەر ئەوە دەبینین بەردەوام هاوڵاتیان سەرقاڵن بە دابینکردنی بژێوی ژیانیان بێ گوێدانە بەشداری سیاسی و گرنگیدان بەبوارەکانی ژیانی سیاسی کۆمەڵگە.

تا ئێستا پێناسەیەکی دیاری کراو بۆ چەمکی هەژاری لە جیهان سێیەمدا نیە بەو پێیەی چەمکێکە لە دیاردە کۆمەڵایەتیە ئابووریەیە ئاڵۆزەکان دەکۆڵێتەوە هەروەها چەمکێکە بەپێی جیاوازی کات و هۆکارەکانی پێوانەکردن و سروشتی کۆمەڵگا و بانگراوندی فکری و ئاکاری دەگۆڕێت . بەڵام ئەوەی کە لە هەموو حاڵەتەکاندا هاوبەشە بریتییە لە (بێبەش بوونی ڕێژەیی چینێکی دیاری کراوی کۆمەڵکە .
بۆ ئەم مەبەستە چەند پێناسەیەك بە نمونە دەهێنینەوە :

- پێناسەی (بانکی نێودەوڵەتی): (هەژاری واتا بێ توانایی لە دابین کردنی لانی کەمی ئاستی بژێوی) بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە مەبەست چییە لە (لانی کەم )؟ (الحد الادنی). هەژاری لە وولاتێکی وەك هندستان واتە نەبوونی خۆراکی پێوویست بۆ بەردەوامبوونی ژیان بەڵام لە ئەورووپا واتە جیاوازی نێوان داهاتی تاکە کەس.

- بیرمەندانی بواری (گەشەپێدان) دەڵێن: (هەژاری واتە پۆلێن کردنی تاك بۆ خودی خۆی کە ئایا لە هەژارەکانە یان نا). بەڵام ئەم پێناسەیە تەواو نییە چونکە پشت بە پێوەرێکی خودی (زاتی) ئەبەستێت لە دیاریکردنی چەمکی هەژاری.

- پێناسەی (دکتۆر محەمەد حسین) خاوەنی کتێبی (هەژاری و ڕێو شوێنی بەرەنگاربونەوەی)، دەڵێت (هەژاری واتە حاڵەتێك لە بێبەشبوونی ماددی کە لە نزمبوونەوەی ئاستی بەکارهێنانی خۆراك و ئاستی تەندروستی و فێرکردن و لە دەستدانی هۆکارەکانی بەرەنگاربوونەوەی خۆی دەبینێتەوە). هەرچەندە ئەم پێناسەیە دەست نیشانکردنێکی زانستیانەی تێدایە بەڵام زیاتر بەلای وەسفکردنێکی دیاردەی هەژاریدا دەڕوات نەوەك باس کردنێکی وەك چەمکێك.

- پێناسەی (دکتۆر عبدلرزاق الفارس) خاوەنی کتێبی (هەژاری و دابەشکردنی داهات لەنیشتمانی عەرەب ساڵی ۲۰۰۰) بەپێی بۆچوونی (عبدالرزاق فارس) چەمکی هەژاری لەسەر دووپرەنسیپ بنیات نراوە أ. ئاستی بژێوی ب. داهات و مافی بەدەستهێنانی لانی کەمی پێداویستیەکان و لەئەنجامدا دەگاتە ئەم پێناسەیەی خوارەوە (هەژاری واتە بێتوانای لە بەدەستهێنانی ئاستێکی بژێوی ماددی دیایکراو کە مەعقول و قبولکراوبێ لە کۆمەڵگەیەك و لە کاتێکی دیاریکراودا). بەمشێوەیە پرەنسیپ و بنەماکانی چەمکی هەژاری لەم پێناسەیەوە رون دەبێتەوە.

- **هەڵوێستی نەتەوەیەکگرتوەکان سەبارەت بە هەژاری:**

نەتەوەیەکگرتوەکان لەسەرەتای دروست بوونیەوە هەتا ئێستا گرنگی ئەم گرفتەی زانیوە و هەوڵی داوە لەرێی (رێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵ FAO) کەلە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە چارەسەری ئەم کێشەیە بکات. لەماوەی تەمەنیدا چەندین هەوڵ هەبووە لەوانە ئەو راگەیاندنەبوو کە لەخولی ۳۱ ی بەرواری ٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ۲۰۰۱ راگەیەنرا کە تیایدا هاتوە ( تراژیدیای هەژاری لە جیهانی دەوڵەمەندا تاکو ئێستا – ساڵی ۲۰۰۱– بەردەوامە و راستیەکی ترسناکە کە لەجیهاندا ۸۱٥ ملیون کەس هەن بەتەواوی بەدەست نەبوونی خۆراکی رۆژانەوە دەناڵێنن کە۷۷۷ ملیۆنی لە وڵاتانی دواکەوتودان). نەتەوەیەکگرتوەکان لە ساڵی ١٩٩٦ ( لە کۆنگرەی جیهانی خۆراك ) پرۆژەیەکی پێشنیارکرد لە بەرازیل کە تیایدا هەوڵبدرێت هەژاری لە جیهاندا تاساڵی۲۰۱٥ بکرێتە نیو ئەوەندە بەڵام لە راستی دا تائێستا

ئامانجەکان بەوئاراستەیەدا نین. لەهەمان کاتدا نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ٢٠٠٨ی بە ساڵی برسێتی ناوبرد چونکە نزیکەی ملیارێك لە دانیشتوانی سەرزەوی دووچاری برسێتی بونەتەوە.

هەربۆیە چارەسەر بەپێی فاو بریتیەلە:

١. چارەسەری خێرا: واتە لەکاتی قەیرانەکاندا پێداویستیە خۆراکی و تەندروستیەکان پێشکش بە لێقەوماوان بکرێت.

٢. چارەسەری هەمیشەیی: واتە هاوکاری بەردەوامی کۆمەڵگە هەژارنشینەکان بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی تیایاندا.

هەرچەندەپێشتر فاو پرۆژەیەکی لە ساڵی ١٩٩٣ لەژێرناوی (پرۆگرامی تایبەتی ئاسایشی خۆراك) بنیات ناوە و کاری لەسەر دەکات کە بریتیەلە یارمەتیدانی جووتیاران لە ٩٥ وڵات. بەڵام تائێستا نەتوانراوە سەرجەم ئەو وڵاتانە بگرێتەوە. سەرەڕای ئەمانەش فاو لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٠)وە سندوقێکی تایبەتی بۆ ئاسایشی خۆراك داناوە بە بڕی (٥٠٠) ملیۆن دۆلار وەك هاوکارییەکی بەردەوام بۆ وڵاتانی هەژارنشین. بەڵام فاو گرفتێکی سەرەکی لە دابەشکردنی ئەو بڕە پارەیەدا هەیە. چونکە ئەگەر ئەو هاوکارییە بەسەر سەرجەم هەژارانی جیهاندا دابەش بکرێت هەر هاووڵاتیەك بەپێی ئەو بڕە پارەیەی کە لە سندوقی فاو لە ساڵی ٢٠٠٠ دا هەیە تەنها ٤٠ سەنتی بەر ئەکەوێت. لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٢دا نەتەوە یەکگرتوەکان کۆنگرەیەکی جیهانی بۆ لێکۆڵینەوەی هەژاری تەرخانکرد. بەڵام جگەلە کۆکردنەوەی هەندێ هاوکاری ماددی نەیتوانی بەرهەمی فراوانتری هەبێ. هەروەها نەتەوە یەکگرتوەکان ١٦ی تشرینی یەکەمی هەموو

ساڵێکی ناوناوە ڕۆژی جیهانی خۆراك كە هاوکاتە لەگەڵ یادی دامەزراندنی فاو.

دەتوانین بڵێین گرنگترین ئەو هۆکارانەی بونەتەهۆی هەژاری لە جیهانی سێیەمدا بریتین لە:

أ. جەنگ و ململانێ بەردەوامەکان کە بونەتەهۆی لەدەستدان و بەفیڕۆدانی توانا مرۆیی و ماددیەکان.

ب. سروشتی سیستەمە سیاسیە فەرمانڕەواکان و نەبوونی پرۆگرامی چاکسازی ئابوری.

ج. ڕێژەی بەرزی ژمارەی دانیشتوان کە دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی بێکاری.

د. هەڵکشان و داکشانی داهاتی نەوت.

ه. بێکاری لە ڕاددەبەدەر کە بەپێی ئامارەکانی بانکی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٩٦ دا ڕێژەی ١٥٪ی خەڵکی وڵاتانی جیهانی سێیەم بێکارن. ئەمەش واتە دوو ئەوەندەی ڕێژەی بێکاری لە وڵاتانی ئەوروپا.

و. بەکارهێنانی ناعەقلانیانەی داهات لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا.

ی. نەخوێندەواری و نەبوونی ئاستی ڕۆشنبیری پێویست.

**چوارەم: قەیرانی ئارامی سیاسی:**

ئارامی سیاسی یەکێکە لە مەرجە هەرە سەرەکیەکانی پرۆسەی گەشەپێدان لە هەمان کاتدا ئامانجێکی سەرەکی ئەم پرۆسەیەیە. قەیرانی ئارامی سیاسی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا دوولایەنی سەرەکی گرتۆتەوە:

### ١. قەیرانی ئارامی دەوڵەت:

زۆربەی بیرمەندانی بواری لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسیەکان پێیان وایە باشترین شێوازی کۆمەڵگە سیاسیەکان بریتیە لەو کۆمەڵگەیەی کە دەوڵەتی نەتەوەیی هەیە، چونکە لەم دەوڵەتەدا ڕەگەزە مرۆییە جیاوازەکان هاوتا دەبن و ئەمەش دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی یەکێتی نیشتمانی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، بەمەش گرفتەکانی پێکدادان و لاوازبوون و هەڵوەشانی کۆمەڵگە کۆتایی پێ دێت، واتە دەبێتە کۆمەڵگەیەکی ئارامی سیاسی تەواو.

لەمێژوودا ئیمپراتۆریەتەکان کاریان لەسەر کۆکردنەوەی زۆرەملێی خەڵك دەکرد ئەو خەڵکانەش لە کۆمەڵێك نەتەوە و ڕەگەز و زمان و نەژادی جیاواز پێکهاتبوون، بەڵام ملکەچی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان بووبوون، ئەمەش بەهۆی هێز و دەسەڵاتیان. ئێستاش لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم هاوشێوەی ئەو ئیمپراتۆریەتانە پێکهاتوون لە چەندین نەتەوە و ڕەگەز و نەژاد و زمانی جیاواز، مامەڵەی نادادپەروەرانەی دەوڵەت لەگەڵ ئەو پێکهاتە جیاوازانە بوەتەهۆی سەرهەڵدانی ئاژاوەگێری و نائارامی سیاسی لەدەوڵەتدا، لە دەوڵەتانی جیهانی سێیەمدا ڕەگەزێکی دیاریکراو دەستی بەسەر دەوڵەتدا گرتوە و دەسەڵات لە خزمەت بەرژەوەندی ڕەگەز و پێکهاتەکەی خۆی پراکتیزە دەکات.

لە ئەنجامی ئەو نایەکسانی و نادادپەروەرییەی دەوڵەت بەکاری دەهێنێت لە بەرامبەر ڕەگەزەکانی دەرەوەی دەسەڵات چەندین بزوتنەوەی (سیاسی-کۆمەڵایەتی) دروست بوون کە ئامانجیان یان

بریتیە لە کۆتایی هێنان بەو نادادپەروەری و چەوساندنەوەیە، یان بریتیە لە هەوڵدان بۆ جیابوونەوە لەو کۆمەڵگەیەی کە تەعبیر لە ڕەگەز و ناسنامە و نەژاد و نەتەوەیان ناکات، لە ئەنجامی هەموو ئەمانەش ناثارامی سیاسی لە دەوڵەتدا سەرهەڵدەدات.

لە گرنگترین نمونەی ئەو ڕەگەزە چەوساوانەی کە لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا هەن (کورد لە عێراق و تورکیا و سوریا و ئێران، سیخ لە هیندستان، ئەمازیغ لە وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەبی، تبتیەکان لە چین، تامیل لە سریلانکا، عەرەب لە ئێران، مارۆنی و شیعە لە لوبنان، شیعە لە عێراق، جادین لە ئەسیوبیا، هەرێمی مۆرۆ لە فلیپین، مهاجر قومی لە کەراتشی لە پاکستان، شنیاجۆنگ لە بەنگلادیش، میسکیتۆ لە نیکاراگوا، هودو لە بوروندی، تورك و یۆنانی لە قبرص،...هتد).

ئامانجی سەرەکی زۆرینەی بزوتنەوەکانی جیهانی سێیەم بریتیە لە جیابوونەوە بە بەکارهێنانی سەرجەم هۆکارەکان تەنانەت ئەگەر توندوتیژیش بێت، وەك (شەڕی باندەکان، فڕاندن، کاری تێکدرانە، ئەشکەنجەدان، خۆپیشاندانی توندوتیژانە،...هتد).

بزوتنەوە جوداخوازەکان لەزۆربەی کاتدا یان بونەتە هۆی تێکدانی یەکێتی نیشتمانی وڵات وەك (هند لەساڵی ١٩٤٧ – پاکستان لەساڵی ١٩٧٢ – ئەسیوبیا لەساڵی ١٩٩٣) یان بونەتە هۆی سەرهەڵدانی جەنگی ناوخۆیی وەك (سودان – لیبیریا – سریلانکا – ڕواندا – لوبنان) یان بونەتە هۆی ڕوودانی ئاژاوەگێڕی لەناوخۆی وڵات وەك (هیند پاکستان – ئەندۆنیزیا).

٢. **قەیرانی ئارامی سیستمی سیاسی:**

مەبەست لە سیستمی سیاسی ئەو دامەزراوە سیاسییە فەرمییانەی دەوڵەتە کە بەپێی یاسا رێکخراون و بەردەوامن لە کارکردن. بەردەوام سیستمی سیاسی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا رووبەرووی چەندین گرفت بوەتەوە، لەپێش هەموویان ئەو کودەتا سەربازییانەی کە ئەم وڵاتانە بەخۆیانەوە بینیوە بەتایبەت ناوچەی (ئەمریکای لاتین) دەوڵەتانی ئەم ناوچەیە لەماوەی دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی تا سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم زیاتر لە (٥٥٠) کودەتای سەربازی تیادا روداوە، بەشێوەیەك سەرۆکی پێشووتری کۆڵۆمبیا (ئیدواردۆ سانتۆس) لەم بارەیەوە دەڵێت: (سەرجەم وڵاتانی ئەمریکای لاتین لەلایەن سوپاکانیەوە بەبەردەوامی داگیرکراون).

لە کیشوەری ئەفریقیاش لەماوەی ساڵانی (١٩٦٣-١٩٧٨) (٣٠) کودەتای سەربازی سەرکەوتوو ئەنجامدراو، جگە لەو کودەتایانەی کە سەرکەوتوو نەبوون. هەروەها لەنێوان ساڵانی ١٩٨٥-١٩٩٦ ، تەنها لە (غانا) (٥) کودەتا و لە (نەیجیریا) (٦) کودەتای سەربازی سەرکەوتوو ئەنجام دراوە، بە کۆی گشتیش لەنێوان ساڵانی (١٩٦٠-١٩٨٦) لە کیشوەری ئەفریقیا (٦٤) کودەتای سەربازی ئەنجام دراوە.

لە کیشوەری ئاسیاش لەنێوان ساڵانی (١٩٣٢-١٩٨٥) لەتایلەند (١٨) کودەتا ئەنجام دراوە کە زۆربەی شکستی هێناوە، هەروەها عێراق لە (١٩٣٢-١٩٤١-١٩٥٨-١٩٦٣-١٩٦٧-١٩٦٨) و ئێران (١٩٧٩).

سەرجەم ئەو کودەتا سەربازییانە دامەزراوەکان و پێکهاتەکانی سیستمی سیاسی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بەرەو نائارامی سیاسی

بردوه، دواتریش ئەم نائارامیە سەرجەم پێکهێنەرەکانی سیستمی سیاسی گرتۆتەوە.

**پێنجەم: قەیرانی رێکخستنی دەسەڵات:**

مەبەست لە رێکخستنی دەسەڵات واتە ملکەچی دەسەڵات و پراکتیزەکردنی بەپێی یاسایەك کە خۆی لە دەستوردا دەبینێتەوە و فەرمانڕەوا و گەل پابەندن پێوەی بەشێوەیەکی یەکسان، ئەو دەستوورە ئەبێ لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کار بکات کە بیرمەند (مۆنتیسکیۆ) بۆ یەکەمجار لەسەدەی هەژدە بانگەشەی بۆ کردوە.

دەسەڵات لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بۆتە دەسەڵاتێکی شەخصی و دەستووری وڵات ئەگەر هەبێت تەنها دەستوورێکی نوسراوە و جێبەجێ ناکرێت، هەر بۆیە دەسەڵات لەم وڵاتانەدا بە چەند تایبەتمەندیەك دەناسرێتەوە:

١. گشتگیری (الشمولیة).
٢. نەبونی توانای گۆڕانکاری.
٣. چڕکردنەوەی دەسەڵات لەدەستی کەسێکدا.
٤. جێبەجێ نەکردنی دەستوور.
٥. نەبونی شەرعیەت.

بۆ نموونە لە کیشوەری ئەفریقیا و لە جەزائیر ساڵی (١٩٦٥) لەڕێی کودەتایەکی سەربازییەوە (هواری بومدین) سەرۆکی بەرەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کۆتایی بە دەسەڵاتی سەرکردەی هەڵبژێردراو

(ئەحمەد بن بيللا) هێنا و فەرمانڕەوایی وڵاتی گرتە دەست بەبێ دەستوور تا ساڵی (١٩٧٦) کە دەستورێکی هێنایەکایەوە زیاتر سیستمی تاك حزبی پێ چەسپاند.

ئەم حاڵەتە لە چەندین وڵاتی تری وەك (غانا لە سەردەمی نکروما، غینیا لە سەردەمی ئەحمەد سیکۆتۆری، تونس لە سەردەمی حبیب بورقیبە. لیبیا لە سەردەمی موعەمەر قەزافی، ئەسیوبیا لە سەردەمی هیلاسیلاسی و مانچستۆ. کۆتدیڤوار (ساحل عاج) لە سەردەمی لیوانجینی، تەنزانیا لە سەردەمی نیریری. زامبیا لە سەردەمی کاوندا، مالاوی لە سەردەمی باندا، زائیر لە سەردەمی مۆبۆتۆ سیسیسیکۆ،...هتد)، لە سەرجەمیان بە ناشەرعی دەسەڵاتیان وەرگرتووە نەیانتوانیوە بەپێی دەستورێکی گونجاوی قبوڵ کراو لەلایەن هەموو لایەکەوە فەرمانڕەوایی بکەن.

لە کیشوەری ئاسیاش بەهەمان شێوە زۆرینەی دەسەڵاتەکان شەرعیەتیان نەبوە و نییە، بۆ نموونە (فلیپین لە سەردەمی مارکۆس، ئەندەنوسیا لە سەردەمی سۆکارنۆ و سۆهارتۆ، سوریا لە سەردەمی حافز ئەسەد و بەشار ئەسەد، عێراق لە سەردەمی سەدام حوسێن، مالیزیا لە سەردەمی مهاتیر محمد).

لە ئەمریکای لاتینیش هەمان حاڵەت هەیە بۆ نمونە (کوبا لە سەردەمی کاسترۆ) کە بە کودەتای سەربازی لە ساڵی (١٩٥٩) دەسەڵاتی گرتەدەست و تائێستاش لە دەسەڵات ماوەتەوە. لە (چیلی، بینۆشیە) لە ساڵی (١٩٧٣) کۆتایی بە دەسەڵاتی (سلفادور ئەلێندی) هێنا و سیستەمێکی دیکتاتۆری دروستکرد. هەروەها لە (نیکاراگوا،

ئەنستازیو سوموزا گارسیا) دەسەلاتی گرتەدەست پاش ئەوەی هێزی ئەمریکا لە ولات چونە دەرەوە (سۆمۆزا) هەستا بە کوشتنی (ئۆمبستۆ سانرینۆ)ی سەرۆکی هێزی ئازادیخوازی ڕزگارکەری (نیکاراگوا)، (سۆمۆزا) بوە سەرۆك و دوای خۆی دوو کوڕی دەسەلاتیان گرتەدەست و فەرمانڕەوایی (ئال سۆمۆزا) بەردەوام بوو تا سالی (١٩٧٩).

بەشێوەیەکی گشتی فەرمانڕەوا لە جیهانی سێیەمدا دەستی گرتوە بەسەر سەرجەم کاروباری ژیانی سیاسیدا و دەستور ئەگەر هەبێ تەنها نوسراوێکە جێبەجێ ناکرێت، فەرمانڕەوا کورسی دەسەلات چۆل ناکات تەنها لە حالەتی مردن و کودەتای سەربازیدا نەبێ.

سەرۆکی دەسەلاتە سیاسیەکان لە سەرجەم لایەنەکانی ژیاندا بونیان هەیە، بۆ نموونە لە سەردەمی (سەدام حوسێن) لە عێراق سەیر نەبوو ئەگەر لە یەکێك لە ڕۆژنامەکاندا ئەم هەوالە بخوێنێتەوە (سەرکردەی قارەمان سەدام چوو بۆ قوتابخانەی سەدام لەشەقامی سەدام، پاشان چوو بۆ دامەزراوەی سەدام، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە چوو بۆ بنکەی شەمەندەفەری سەدام پاشان سەرۆك سەدام چوو بۆ بەسەرکردنەوەی دەریاچەی سەدام پاشان گەڕایەوە بۆ کۆشکەکانی سەدام)، لە هەندێ حالەتدا وێنەی سەرۆك لەسەر دراوی کاغەز و ئاسن و سەرجەم شوێنەکانی ولات دانرا بوو.

سەرۆکی زائیر ناوی خۆی لە (جۆزێف مۆبۆتۆ) گۆڕی بە (مۆبۆتۆ سیسیسیکۆ کۆکۆ نجندوا وازابانجا) واتە (شەڕکەری ئەفسانە کە هەمیشە سەرکەوتوە بەهۆی زەبروزەنگەوە بەردەوام لە سەرکەوتنێکەوە دەڕوات بۆ سەرکەوتنێکی تر و لە دوای خۆی شەڕ بەجێ دێلێ). وەزیری ناوخۆی زائیر لە پیاهەلدانی (مۆبۆتۆ سیسیسیکۆ)دا دەلێ: (لە

هـــەموو ئاینێــك و ســـەردەمێکدا پێغەمبـــەرێك هەیـــە ئـــەمڕۆ خـــوا پێغەمبـەرێکی بـۆ ئێمـە نـاردووە ئـەویش سـەرکردەی ڕێنیـشاندەرمان مۆبۆتۆیـــە ئـــەو ڕزگارکەرمانـــە و مەســـیحمانە، پاپـــا و ســـەرۆکی کەنیسەمانە، پێویـستە وێنـەی مەسـیح و صـەلیبی مەسـیح و مۆبۆتـۆ هەڵواسن بەیەکەوە).

## گرنگی پارتی سیاسی لە جیهانی سێیەمدا لەچیدایە؟

لەڕاستیدا ئەو سیستەمە سیاسییانەی لە ولأتانی جیهانی سێیەمدا هەن ڕێگە بە بوون و گەشەسەندنی پارتی سیاسی نادەن. ئەو پێکهاتـە حزبییانـەش کـە لـەم ولأتانـەدا هـەن هـەرگیز پێکهاتەیـەك نـین بـواری ململانێ و کێبڕکێ بڕەخسێنن. واتە زیاتر پێکهاتەیەکی تاك حزبی یان پارتی سـەرکردەن. کە لـەکۆی گشتیدا ڕێگـە بەبوونی پـارتی سیاسیتر نـادات، یـان ئەگـەر ڕێگـەش بـەبوونیان بـدات ئـەوا بـە هـیچ جۆرێك ئـەو پارتانـە نـاتوانن ململانێـی ی سیاسـی لەگـەڵ پارتـە دەسـەڵاتدارەکەدا بکەن کە بە پارتی سەرکردە ناسراوە.

پارتـە سیاسییەکانی جیهانی سێیەم زیـاتر وەك هێزێکـی ڕزگارکـەر خۆیـان دەناسـێنن، ئـەم ناوونیـشانەش تاڕاددەیـەکی زۆر بوەتەمایـەی هەوڵدانیان بۆ پارێزگاریکردن لـە دەسـەڵات، چونکە ئەو هێزەی خـۆی وەك ڕزگارکەر دەناسێنێت ئامادە نیـە هـەروا بـە ئاسـانی دەستبەرداری ئەو دەسەڵاتە سیاسییە بێت کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ وەریگرتووە.

وەك لە ئەرکەکانی پارتی سیاسییدا ئاماژەمان پێدا، بابەتی هاندانی بەشداری سیاسی خەڵك لە گرنگترین ئەو ئەرکەکانە کە پێویستە پارتی سیاسی لە کۆمەڵگەدا جێبەجێیان بکات. بەشێکی زۆریش لەبیرمەندان پێیان وایە گرنگترین جیاوازی نێوان کۆمەڵگەی پێشکەوتوو کۆمەڵگەی دواکەوتوو بریتیەلە بوونی بەشداری سیاسی لە کۆمەڵگە پێشکەوتوەکان و نەبوونی یان لاوازی لە کۆمەڵگە دواکەوتوەکاندا.

چەندین بیرمەند لەبارەی چەمکی بەشداری سیاسی لێکۆڵینەوە و بۆچوونەکانیان خستۆتەڕوو بۆ نموونە (سامۆئیل هنتگتۆن) پێی وایە (بەشداری سیاسی جۆرێکە لە چالاکی سیاسی کە هاووڵاتیانی ئاسایی ئەنجامی دەدەن بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکانی حکومەت). لەلایەکیترەوە بیرمەند (مایرۆم واینتەر) پێی وایە (بەشداری سیاسی کۆمەڵێك ڕەفتاری ئیدارییە، مەبەست لێی دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر پرۆسەی سیاسەتی گشتی و بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگە. هەروەها لەم ڕێگەیەوە سەرکردەکان هەڵدەبژێردرێن بۆ ئاستەکانی حکومەت).

کەواتە بەشداری سیاسی جۆرێکە لە چالاکی سیاسی کە هاووڵاتیانی ئاسایی ئەنجامی دەدەن بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکانی حکومەت.

- ئەو چالاكيانەی بە بەشداری سیاسی دەژمێردرێن:

١- پرۆسەی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا.
٢- خۆپیشاندان.
٣- ئیمزا کۆکردنەوە و پێشکەشکردنی بە دەسەڵات.
٤- پرۆسەی نوێنەرایەتیکردنی پەرلەمانی.
٥- بەشداربوون لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا.
٦- بوون بەئەندام لە پارتە سیاسیەکاندا.
٧- بوون بەئەندام لە گرووپی فشار.
٨- تەرخانکردنی بەشێك لە کاتەکان بۆ بابەتە گشتیەکان.
٩- نووسینی پەرتوك و بڵاوکردنەوەی بابەت لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا.
١٠- خوێندنەوەی پەرتوك و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.
١١- گوێ گرتن لەو لێکدانەوە و پرۆگرامانەی رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئاژانسەکانی هەواڵ پێشکەشی دەکەن.
١٢- گۆشەگیربوون.
١٣- هەر هەوڵێك بۆ گۆڕینی واقیعی سیاسی کۆمەڵگە.

پارتی سیاسی دەتوانێت لە هەر یەکێك لەم ڕێگایانەی سەرەوە خەڵکی هان بدات بۆ بەشداریکردنێکی سیاسییانەی کارا و کاریگەر لە سەرجەم ئەو بوارانەی بە بەشداری سیاسی ئەژمار دەکرێن. ئەم ڕێگایانەش بەڵگەی تەواون لەسەر قۆرخنەکردن و قەتیس نەبوونی بەشداری سیاسی لە بوارێکی دیاریکراوی تەسکدا.

- **تایبەتمەندییەکانی بەشداری سیاسی:**

پرۆسەی بەشداری سیاسی کۆمەڵێك تایبەتمەندی هەیە کە لە کۆی گشتیدا لە چوارچێوە گشتییەکەی پرۆسەی بەشداری سیاسی تێدەگەین. لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەش:

١. بەشداری سیاسی چالاکییەکی خۆبەخشانەیە بەمەبەستی پێدانەوەی ڕۆڵی کارا بە مرۆڤ بەبێ زۆرەملێ.

٢. بەشداری سیاسی ڕەفتارێکی بەدەستهاتووە و شتێك نییە لەگەڵ زادەی مرۆڤدا هاتبێتە کایەوە، بەڵکو دواتر مرۆڤ پراکتیزەی دەکات.

٣. بەشداری سیاسی ڕەفتارێکی واقعیانەی پۆزەتیڤە و مەبەست لێی پێدانی ڕۆڵە بە جەماوەر و خەڵك.

٤. بەشداری سیاسی پرۆسەیەکی تۆکمە و پتەو و فرەڕەهەندە و ئامانج لێی هاندانی زیاتری مرۆڤەکانە بە ئاراستەی ڕۆڵبینین و دۆزینەوەی پێگەی خۆیان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کۆمەڵگە.

٥. بەشداری سیاسی لە تەنها چالاکی و ڕەفتارێکدا کورت نابێتەوە، بەڵکو چەندین چالاکی جۆراوجۆر لەخۆدەگرێت و دەگونجێت لەیەك کاتدا چەندین ڕەفتار و شێوازی بەشداری سیاسی ئەنجام بدرێت.

٦. بەشداری سیاسی لە تەنها ناوچەیەکی جوگرافی و پێگەیەکدا قۆرخ ناکرێت، بەڵکو چالاکییەکی ناوخۆیی و ئیقلیمی و نێودەوڵەتیە.

٧. بەشداری سیاسی لەهەمان کاتدا ماف و ئەرکە، مافێکە کە مرۆڤەکان پراکتیزەی دەکەن، ئەرکی ئەو مرۆڤانەشە بەرامبەر کۆمەڵگەکەیان.

٨. بەشداری سیاسی لەهەمان کاتدا هۆکار و ئامانجە، لەلایەك هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گشتییەکانی کۆمەڵگە، لەلایەکی تریشەوە ئامانجێکە کە تیایدا مرۆڤەکان پراکتیزەی ژیانی سیاسی خۆیان دەکەن.

٩. بەشداری سیاسی دەبێتەهۆی یەکبوونی فکر و هزری جەماوەر سەبارەت بەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتیدان.

- **بوارە سەرەکیەکانی بەشداری سیاسی:**

١. وەرگرتنی پۆستە وەزیفی و ئیدارییەکان: هەڵبژاردنەکان باشترین ڕێگای وەرگرتنی پۆستە سیاسی و ئیدارییەکانە لە جیهانی پێشکەوتوودا. پێویستە لەم بوارەدا هاووڵاتیان ڕۆڵی سیاسی خۆیان بسەلمێنن و بە ئازادانە بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن و خۆیان بۆ پۆستە سیاسیە باڵا و ناوەندییەکان بپاڵێون. ئەمەش تەنها لە حاڵەتی بوونی کەشێکی ئازاددا بەدی دێت. لە مێژووشدا دەیان نموونەی هاوڵاتی سەرکەوتوومان لەم بوارەدا هەیە لەسەر ئاستی جیهانی.

٢. ئەندامێتی لە پارتە سیاسیەکاندا: ئەگەر پارتی سیاسی بریتی بێت لە کۆبونەوەی کۆمەڵێك خەڵك لەپێناو گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو، ئەوا بەدڵنیاییەوە تاکەکان دەتوانن ببنە بەشێکی سەرەکی لەو کۆبوونەوەیە و بگرە ئەوانیش دەتوانن ببنە سەرکردەی پارتە سیاسیەکان و پێشرەوی کۆمەڵە خەڵکێك بکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دیاریکراو.

٣. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی: لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا چەندین پێکهێنەری سەرەکی هەن کە هاوولاتیان دەتوانن ڕۆڵی خۆیانی تێدا بگێڕن، لە گرنگترین ئەو پێکهێنەرانەش (ڕێکخراوە ناحکومیەکان، سەندیکاکان، دەزگاکانی ڕاگەیاندن، سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە، زانکۆکان، سەنتەرەکانی لاوان و خوێندکاران و ژنان، گروپە کۆمەلآیەتیەکان، یانە وەرزشی و هونەرییەکان،....هتد)، کە لە سەرجەمیاندا بوونی هاوولاتیان و ڕۆڵگێڕانی سەرەکییان کارێکی پێویستە و ناکرێت ئەم پێکهێنەرانە بە پێکهێنەری چالاك دابنرێن بەبێ بوونی بەشداری هاوولاتیان تیایاندا.

- **هەنگاوەکانی هاندانی بەشداری سیاسی:**

لەپێناو ئەوەی پارتی سیاسی بتوانێت پرۆسەیەکی تۆکمە و پتەوی بەشداری سیاسی لە کۆمەڵگەدا بێنێتەکایەوە، ئەوا پێویستە کار بکات بۆ هێنانەدی چەندین هەنگاوی گرنگ، لەوانە:

١. پاڵپشتی چەسپاندنی دیموکراسی لەنێو کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا. بەتایبەتی ئەوانەی بۆ زەمەنێکی فراوان دووچاری دیکتاتۆریەت و ستەمکاری بوونەتەوە، ئەمەش ئەرکی سەرەکی ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و هێزە سیاسیە دیموکراتخوازەکانە. لەنێو ئەو دیموکراتیەشدا هاولاتیان دەتوانن پێگە سیاسیەکانی خۆیان بدۆزنەوە و ئاراستەی بەشدارییەکی سیاسیانەی ڕاستەقینە بەدی بهێنن.

٢. گۆڕین و چاکسازیکردن لە عەقڵی کۆمەڵگە. بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە قۆرخنەکردنی بوارە گشتی و تایبەتەکانی کۆمەڵگە و بابەتی بەشداری سیاسی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کۆمەڵگە.

٣. هاندانی پرۆگرامەکانی هۆشیارکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵگایانەی پێویستییەکی لەراددەبەدەریان هەیە بە پرۆسەی بەرەوپێشبردن و بەرزکردنەوەی هۆشیاری تاك، ئەمەش لە بەهای کاری سیاسییانەی هاولاًتیان زیاتر دەکات.

٤. ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی دەربارەی مافەکانی مرۆڤ و چۆنێتی چەسپاندن و دابینکردنی مافەکانی هاوولاًتیان. بەتایبەتی لەکاتێکدا توێژینەوە ئەکادیمیەکان لەم بوارەدا لاوازن و نەیانتوانیوە ببنە بنەمای بەشداری سیاسی هاوولاًتیان و سەرهەڵدانی ئاراستەیەکی نوێی کارکردنی سیاسییانەی هاوولاًتیان.

٥. دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە هەر چوار جۆری (بینراو، بیستراو، نووسراو، ئەنتەرنێت) ئەرك و ڕۆڵێکی سەرەکییان لە ئەستۆدایە لە پرۆسەی هاندان و پاڵپشتی بەشداری سیاسی هاوولاًتیان و کردنەوە و فراوانکردنی ئەو دەروازەیەی کە هاولاًتیان دەتوانن لێیەوە ببنە بەشێك لە بەڕێوەبەرانی پرۆسەی سیاسی کۆمەڵگە و جیهان.

٦. دۆزینەوەی هاوسەنگییەك لەنێوان پێگە سیاسی و پێگە کۆمەلاًیەتییەکەی هاوولاًتیان، تا تێکەڵییەك دروست نەبێ لەنێوان ئەرکی بەشداری سیاسی هاوولاًتی و پێگەکەی لەنێو خێزاندا. بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بەڕێوەبردنی کاروبارە ئیدارییەکانی نێو دامودەزگاکانی دەوڵەت بە حکومی و ناحکومییەوە، هەروەها بەڕێوەبردنی خێزان.

٧. دەستکاریکردن و گۆڕانکاریکردن لە یاساکان. بەتایبەتی ئەو یاسایانەی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان هەیە بە مافەکانی هاولاًتیان. لەهەمان کاتدا دەبێ هاولاًتیانیش لەو یاسایانە هۆشیار بکرێنەوە و

بەرچاوڕوون بن لە پێگە و ئەرك و مافی خۆیان لەنێو ئەو یاسایانەدا. هەر بۆ ئەوەش یاساکان باشتر و گونجاوتر بچەسپێن پێویستە هاولاَتیان ڕۆڵێکی فراوانیان هەبێ لە داڕشتنیدا.

٨. هەڵگرتنی هەموو ئەو ڕێگرییانەی وا لە هاوولاَتیان دەکەن بەشداری پرۆسەکانی هەڵبژاردن و بەڕێوەبردنی پۆستەکانی دەوڵەت نەکەن و ئاستی بەشدارییان لاواز دەکەن. وەکو:

أ. پێشکەشکردنی پاڵپشتی ماددی و دەروونی و ڕاگەیاندنی بۆ ئەو هاوولاَتیانی بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنەکان دەکەن تا نەکەونە ژێر کاریگەری ئەو لایەنانەی بە پێدانی ئەو هاوکارییانە بیرکردنەوە و ئاراستەی کارکردنی هاوولاَتیان لە چوارچێوە بدەن.

ب. ڕۆڵبینینی سەرکردایەتییانەی هاوولاَتیانی نێو کۆمەڵگە لە سەرجەم بوار و مەودا و دامەزراوەکانداز ئەم ڕۆڵەش مافێکە و لەجیاتی ئەوەی بە هاوولاَتیان بدرێت دەبێ بسەنرێت.

ج. هەوڵدان بۆ لەناوبردنی سیستەمی (کۆتا) بەوپێیەی بوەتە یەکێك لەو ڕێگرییانەی چارەنووسی بەشداری سیاسی هاوولاَتیان دەخاتە مەترسییەوە. ئەم سیستەمەش لە زۆرێك لە ولاَتانی جیهانی دواکەوتوو مامەڵەی پێدەکرێت. هەربۆیە دەبینین لەم ولاَتە دواکەوتووانەدا هاولاَتیان مەودایەکی تەسك و داخراویان هەیە بەڕووی بەشدارییەکی سیاسی ڕاستەقینە.

لێکۆڵینەوە تایبەتیەکان لە بواری گەشەپێداندا هەردوو لایەنی تیۆری و پراکتیکی گرتۆتەوە بەتایبەت لەدوای شەستەکانی سەدەی رابردووەوە. بەڵام لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوەوە بواری سیاسی بووە گرنگترین بواری لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە گەشەپێدان و پەیوەندی دروستکردن لەنێوان گەشەپێدانی سیاسی و سیستەمی سیاسی. لە ئەنجامی ئەوەشدا بابەتی گەشەپێدانی سیاسی پەیوەست کرا بە چەندین هۆکار و دیاردە لەوانە:

- گۆڕانی سیاسی.
- ئەکتیڤبوون و بەرەوپێشچوونی سیستەمی سیاسی.
- چاکسازی رەهەندی سیاسی.

بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی چەمکی گەشەپێدانی سیاسیەوە لێکۆڵەر و بیرمەندان بۆچوونی جیاوازیان هەیە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین ئەو بۆچوونانە لە سێ گوزارشتی سەرەکیدا کورت بکەینەوە، ئەوانیش بریتین لە:

١. بۆچوونێك پێی وایە گەشەپێدانی سیاسی هەر سێ بواری گەشەپێدانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی پێکەوە گرێ دەدات.

ئەم پێناسەیە بوارە جیاوازەکانی گەشەپێدانی بەیەکترەوە پەیوەست کردووە، ئەو گەشەپێدانەش پەیوەست دەکات بە سەربەخۆیی سیاسەت و رادەی وەڵامدانەوەی سیاسەتەکان لەپێناو چارەسەرکردنی گرفت و کێشە و قەیرانە سیاسیەکان. بەڵام ئەم

پێناسەیە ناتوانێت پێوەرێك بۆ گەشەپێدان دابنێت، بەهۆی ئەستەمی پێوانەکردن و هەڵسەنگاندنی ئاستی چالاکیە سیاسیەکان.

٢. بۆچوونێك پێی وایە گەشەپێدانی سیاسی پەیوەستە بە سیاسەتەکانی کۆمەڵگە پیشەسازیەکان.

ئەم بۆچوونە جەخت دەکاتەوە لەسەر کاریگەری سیاسەتی میانڕەوانە لەسەر پرۆسەی گەشەپێدان لەڕێی کاریگەری هۆکار و ڕێوشوێن و لێهاتوویی دەوڵەت و پاڵپشتیکردنی دەوڵەتە پیشەسازەکان لەم پرۆسەیە لە جیهانی سێیەم.

ئەم بۆچوونەش ڕەخنەی رووبەروو دەکرێتەوە بەتایبەت ئەو حاڵەتەی کە بریتیەلە ڕێگریەکانی بیرۆکراتیەت، کاتێك هەوڵدان بەرەو پرۆسەی گەشەپێدان لەڕێی شێوازێك لە بیرۆکراتیەت بێت ئەوا ئەو بیرۆکراتیەتە ڕێگر دەبێت لە بەردەم توانا و لێهاتوویی پێکهاتە جیاوازەکان.

٣. بۆچوونێك پێی وایە گەشەپێدان پەیوەندی راستەوخۆی بە بەرژەوەندی سیاسیەوە هەیە. بە واتای پەیوەندی نێوان خەڵك و سیستەمی سیاسی و ڕۆڵی دیموکراتی لەو پەیوەندییەدا.

ئەم پێناسەیە لەسەر دوو ڕەهەند قسە دەکات:

ا. ڕەنگدانەوەی گەشەپێدان لەسەر ژیانی کۆمەڵگا.

ب. ڕۆڵی کۆمەڵگا لە ئەنجامدانی پرۆسەی گەشەپێدان.

پێویستە ئەوە بڵێین کە سەرکەوتنی پرۆسەی گەشەپێدان لەسەر دروستبوونی ئەو پەیوەندییە راستەقینەیە وەستاوە کە لەنێوان ئەو دوو رەهەندەدا هەیە. بەجۆرێك هەر کاتێك گەشەپێدان بەشێوەیەکی دروست کاردانەوەی لەسەر ژیانی کۆمەڵگە هەبوو و هەر کاتێك کۆمەڵگە سەرکەوتوو بوو لە دیاریکردنی رۆڵی خۆی لە پرۆسەی گەشەپێداندا. ئەوا ئەوکاتە دەگەینە پرۆسەیەکی گەشەپێدانی سەرکەوتوو کە هاوکار دەبێت لە بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە و دانەبڕانی لە پێشکەوتنەکانی جیهان.

- **قوتابخانەکانی گەشەپێدانی سیاسی ( جیاوازییە ئایدیۆلۆژییەکان ):**

لەماوەی پەنجا ساڵی رابردوودا لێکۆڵینەوە تایبەتیەکانی بواری گەشەپێدانی سیاسی چەندین بۆچوون و تیۆری جیاوازی لەخۆ گرتووە، هەندێك لەو بۆچوونانە پێیان وایە دەگونجێت جیهانی سێیەم بە ئاراستەی سیستەمێکی دیموکراسی ببرێت لە رێگەی پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسیەوە، بەڵام لە هەندێکیتردا بەپێچەوانەوە ئاسۆی سەرهەڵدانی دیموکراسیەت لە جیهانی سێیەم نابینرێت. لەم بوارەشدا پێنج قوتابخانەی سەرەکی سەریان هەڵداوە و هەوڵیانداوە بوارەکانی تایبەت بە گەشەپێدانی سیاسی لێك بدەنەوە، ئەوانیش بریتین لە:

1. **قوتابخانەی مۆدێرنیتە** (مۆدێرنیزم، الحداثة):

یەکێك لە قوتابخانە کاریگەر و سەرەکییەکانی بواری گەشەپێدانی سیاسی قوتابخانەی مۆدێرنیتەیە. کە بۆچوونی سەرەکی لەم بارەیەوە بریتیەلە (گرێدانی پرۆسەی گەشەپێدان لە جیهانی سێیەم بە

سەرمایەداری رۆژئاوا کە لەسەر بناغەی لیبرالیەتی یان "ئازادی" ئابوری و سیاسی بنیاتنراوە). ئەمەش واتە جەختکردنەوە لەسەر بەهاکانی فرەیی و کێبرکێ و خاوەنداریتی تایبەت و پرەنسیپی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان. هەروەها جەختکردنەوە لەسەر بەهاکانی ئازادی و بەشداری سیاسی هاولاتیان لە دەسەلاتی سیاسی و هاوسەنگی نێوان چین و پێکهاتە کۆمەلایەتیەکان.

سەرەتاکانی ئەم قوتابخانەیە دەگەرێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم، بەلام لەمرۆدا ئەم قوتابخانەیە بە بیرمەند (بارسۆنز) دەناسرێتەوە کە جەخت لەسەر چەمکی مۆدێرنیتە دەکاتەوە لەرێی دیاریکردنی ئاستەنگە ناوخۆییەکانی گەشەپێدان و بەستنەوەی بە بارودۆخی دەرەکی بەتایبەت لەهەر سێ لایەنی "سەرمایە، تەکنەلۆژیا، ئایدیۆلۆژیا".

گرنگترین رەخنە کە ئاراستەی ئەم قوتابخانەیە دەکرێت بریتیە لە گواستنەوەی راستەوخۆی چەمکە سیاسی و ئابوریەکان لە کۆمەلگەی سەرمایەداری رۆژئاواوە بۆ جیهانی سێیەم. هەروەها هەوڵ دەدات بۆ ملکەچکردنی جیهانی سێیەم لە بەرامبەر خواستەکانی جیهانی پێشکەوتوو نەك تەنها لەرووی ئابورییەوە بەلکو لەرووی سیاسیشەوە.

٢. قوتابخانەی مارکسی (کلاسیکی):

ئەم قوتابخانەیە بە قوتابخانەی تیۆری مارکسی دادەنرێت و بۆچوونی سەرەکی بریتیەلە (پەیوەندی لەنێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان)، بەشێوەیەك هەر قۆناغێك لە قۆناغەکان پێویستی بە هۆکار و رێوشوێنی گونجاو هەیە. ئەم قوتابخانەیە پێی وایە گۆرانکاری لە کۆمەلگەدا لە یەکێك لەم دوو رێگەیەوە روودەدات:

أ. لەڕێگەی پێشکەوتنێکی چەندێتی لە سیستەمی ئابوری، بەتایبەت لە لایەنی بەرهەمهێنان.

ب. لەڕێگەی شۆڕشێکی ئابوری کە دەبێتەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەهۆی ململانێی نێوان هێزی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان.

ڕەخنەی سەرەکی کە ئاراستەی ئەم قوتابخانەیە دەکرێت بریتیە لەوەی ئەم قوتابخانەیە تەنها لایەنی ئابوری چارەسەر دەکات بەبێ گوێدانە لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵگە. واتە تاڕاددەیەك واقعی سیاسی کۆمەڵگەکانی فەرامۆش کردووە.

٣. **قوتابخانەی پاشکۆیەتی** (التبعية):

بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە لە مارکسیەکانن کە هەوڵ دەدەن چارەسەرێکی نوێی مارکسیانە بۆ پرۆسەی گەشەپێدان پێشنیار بکەن. بەڵام بە مەرجێك لەگەڵ واقعی کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەمدا بگونجێت.

بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە پێیان وایە هۆکاری دواکەوتنی وڵاتانی جیهانی سێیەم بریتیەلە کۆنترۆڵکردنی ئەم وڵاتانە لەلایەن هێزی جیهانی سەرمایەداری، بەشێوەیەك وڵاتانی جیهانی سێیەم بوونەتە پاشکۆی وڵاتانی سەرمایەدار. لەبەرئەوە ئەم قوتابخانەیە پێشنیار دەکات کۆتایی بەو پاشکۆیەتیە بهێنرێت، بەتایبەتی ئەو حاڵەتەی کە پەیوەندی بە دەسەڵاتی سیاسی و سیستەمی سیاسیەوە هەیە. ئەگەر لە حاڵەتێکدا ئەم ئامانجە نەهاتەدی ئەوا جیهانی سێیەم بەپێی ئەم

قوتابخانەیە لە مەترسی کاریگەرییەکانی سەرمایەداریدا دەمێنێتەوە، ئەمەش واتە بەردەوامبوونی ئەو دواکەوتووییەی کە لەم جیهانەدا هەیە.

ئەم قوتابخانەیە تەواو پێچەوانەی قوتابخانەی مۆدێرنیزمە کە بانگەشە بۆ گواستنەوەی ئەزموونی رۆژئاوا دەکات. لە گرنگترین بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیەش بیرمەند (هنریك) و (سانتۆس)ە.

سەرەڕای گرنگی بۆچوونەکانی ئەم قوتابخانەیە، بەڵام کاریگەری و گرنگی هۆکارە نێودەوڵەتییەکانی فەرامۆش کردووە لەئەنجامیشدا سەرکەوتوو نەبوون لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە ئابوری و سیاسیە نێودەوڵەتییەکان.

### ٤. قوتابخانەی تەوافقی سۆشیالیستی (التوافق الإشتراكي):

لە دیارترین بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە هەردوو بیرمەند (سانکل) و (فرانك)ن. بۆچوونی سەرەکییان بریتیەلە پێویستی گرنگیدان بە واقعی وڵاتانی جیهانی سێیەم لەڕێی شرۆڤەکردنی رەهەندی ئابوری و ئەوەی پێی دەوترێت (ئابوری داگیرکەر) واتە (إقتصاديات الإستعمار) کە کاریگەری سلبی هەبووە لەسەر ژیانی گەلانی جیهانی سێیەم. هەروەها بەپێی ئەم قوتابخانەیە تیۆرێکی سیاسی ئابوری نوێ بێتەکایەوە بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی گرفتەکانی گەشەپێدان بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیدارە بە ڕۆڵی دەوڵەت لە پرۆسەی گەشەپێداندا، لەپێش هەموو ئەو ڕۆڵانەشەوە ئەوەی پێی دەوترێت پلاندانان.

ڕەخنەی سەرەکی لەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە جەخت دەکاتەوە لەسەر گەشەپێدانی ئابوری و دەیکاتە ئامانج، بەڵام بابەتی گەشەپێدانی سیاسی دەکاتە بابەتێکی لاوەکی کە لەراستیدا وڵاتانی جیهانی سێیەم پێویستیان بە هەردوو بواری سیاسی و ئابوری هەیە.

٥. **قوتابخانەی ئابوری سیاسی-کلاسیکی نوێ:**

ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی ١٩٨٠ لەسەر دەستی بیرمەندان (تۆی) و (بۆر) سەریهەڵدا کە بە پشتبەستن بە کۆمەڵێك بنەمای کلاسیکی تیۆرێکی نوێیان بۆ ئابوری سیاسی هێنایەکایەوە. هەر ئەم قوتابخانەیەش بە شۆرشێك دادەنرێت لە بواری تیۆرەکانی تایبەت بە گەشەپێدان. هەروەها ئەم قوتابخانەیە پشتی بەستوە بە میتۆدی ئابوری سیاسی وەك یەکێك لە میتۆدە سەردەمییەکان لە شرۆڤەکردنی سیاسیدا.

بۆچوونی سەرەکی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە بانگەشە دەکات بۆ کارلێکردن لەنێوان هێزی ئابوری و سیاسی کۆمەڵگە بەوپێیەی کارلێکردنە سیاسیەکان پەیوەندی راستەوخۆیان هەیە بە لایەنی ئابورییەوە. بەو مانایەی هەر گۆرانکارییەك لە کۆمەڵگادا بەپێی پەیوەندی نێوان هۆکارە ئابوری و سیاسیەکان دیاری دەکرێت و سیاسەت و ئابوری دوو شتی لێك دانەبڕاون. چارەسەری سەرەکی گرفتەکانی گەشەپێدانیش بەپێی بۆچوونی ئەم قوتابخانەیە بریتیەلە تەسکردنەوەی بواری کەرتی گشتی و بانگەشەکردن بۆ بازرگانی ئازاد.

رەخنەی سەرەکی کە ئاراستەی ئەم قوتابخانەیە دەکرێت ئەوەیە کە بانگەشە بۆ دانانی بازار و بازرگانیەکی ئازاد دەکات بەبێ گوێدان بە یاسا و ڕێسا و دیسپلینەکان، ئەمەش واتە بەردەوام بوونی پاشکۆیەتی وڵاتانی جیهانی سێیەم بۆ وڵاتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا.

ئەم رەخنەیە کەمترین رەخنەیە کە ئاراستەی ئەم قوتابخانەیە کراوە لەچاو هەریەك لەو رەخنانەی کە ئاراستەی چوار قوتابخانەکەیتر کراوە. بە واتای ئەوەی ناتوانرێت لە گرنگی و بەهای قوتابخانەی ئابوری سیاسی کلاسیکی نوێ کەم بکاتەوە.

ئەم پێنج قوتابخانەیە کۆمەڵێك بۆچوون و بیروڕان کە لە جیاوازیە ئایدیۆلۆژیاکانەوە سەرچاوە دەگرن، بەپێی دیاریکردنی ڕۆڵ و کاریگەری ئابوری و سیاسی لە پرۆسەی گەشەپێداندا. پێویستە پاش ئەم لێکۆڵینەوانە بزانین خاڵی بەهێز و لاوازی هەریەك لەم قوتابخانانە چییە؟ چونکە ئەمەش هاوکار دەبێت لە دیاریکردنێکی میتۆدیانەی پرۆسەیەکی گەشەپێدانی بەردەوام کە هەردوو بواری کاریگەری واقعی جیهان لەسەر وڵاتانی جیهانی سێیەم لەلایەك و لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاستی بژێوی خەڵك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم لەلایەکی تر لەخۆ بگرێت. ئەمەش دەتوانێت هۆکار و ڕێوشوێنی نوێی هاوتا لەگەڵ گۆڕانکارییەکان بدۆزێتەوە بەمەبەستی ئەنجامدانی پرۆسەیەکی گەشەپێدانی سەرکەوتوو.

پارتە سیاسییەکان پێویستە لە روانگەی قوتابخانەی پێنجەمەوە کە قوتابخانەی (ئابوری-سیاسی کلایکی-نوێ)یە. بەتایبەت لە وڵاتانی دواکەوتوودا پێویستە بە میتۆدێکی سیاسییانەی لیبراڵییانە و بە پاڵپشتی ئابورییەکی ئازاد کاربکەن بۆ بەرەوپێشبردنی ئاستی ژیان و

هێنانەکایــەی گەشــەپێدانێکی سیاســی ســەرکەوتوو لــەنێو ئــەو کۆمەڵگایانــەی کــە زۆرتــرین پێویــستییان بــە گەشــەپێدان هەیــە و تــا ئێستاش ئەو پارتە سیاسییانەی کە لە کۆمەڵگەکاندا هەن نەیانتوانیوە رێژەیەکی دیاریکراویش لە گەشەپێدان بەدی بهێنن.

• **ئاستەنگەکانی بەردەم پارتی سیاسی لە بەدیهێنانی گەشە پێدان:**

لــە جیهــانی ســێیەمدا کۆمــەڵێك ئاســتەنگ رووبــەرووی پارتــە سیاســییەکان دەبێتــەوە کــە دەبێتــەهۆی رێگریکــردن لــە بــەدیهێنانی پرۆســەیەکی گەشــەپێدانی ســەرکەوتوو. ئــەم ئاســتەنگانەش زیــاتر پەیوەنــدی بــە خــودی کۆمەڵگاکانــەوە هەیــە. لــە گــرنگترین ئــەو ئاستەنگانەش:

1. **دیاردەی جیهانگیری:**

ســــەرەڕای جیــــاوازی بۆچــــوون و لێکۆڵینــــەوەکان دەربــــارەی ڕەهەنــدەکانی دیــاردەی جیهــانگیری و سروشــتی بەرەوپێشــچوون و کاریگەرییــە ئــابوری و کۆمەڵایــەتی و فەرهەنگیــەکان، بــەڵام چــەندین کاریگــەری راســتەوخۆ و ناڕاســتەوخۆی هەیــە لەســەر هــەوڵی پارتــە سیاســییەکان بــۆ بــەدیهێنانی گەشــەپێدان و مــافی مــرۆڤ لــەپێش ئــەم هەموو کاریگەرانەوە لاوازبوونی ڕۆڵی دەوڵەت لە پرۆسەی گەشـەپێدان بەتایبەت لە بواری ئابوری و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی پێکهاتـە و چینـە کۆمەڵایەتیـەکان و هـەر بابـەتێکی تـر کـە پەیوەسـتە بـە مـافی مـرۆڤ و گەشەپێدان.

٢. **فێرکردن:**

بە یەکێك لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دادەنرێت و هۆکارێکی زانستی و عەمەلیە بۆ بەرەوپێشچوونی هەر کۆمەڵگەیەك. بەڵام لەم بوارەدا چەندین ئاستەنگ دێتە بەردەم پارتە سیاسییە دەسەڵاتدار و ئۆپۆزسیۆنەکان لە بەدیهێنانی پرۆسەی گەشەپێدان و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست بەتایبەتی و جیهانی سێیەم بەگشتی وەکو (دیاردەی نەخوێندەواری بەتایبەت لەنێوان ژناندا، لاوازی توانای وەرگرتنی خوێندنی پێشکەوتوو لە دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکردنەکان، دابەزینی رێژەی تەرخانکراو بۆ فێرکردن و دامەزراوەکانی فێرکردن، لاوازی ئاستی فێرکەران...هتد).

لە نوێترین لێکۆڵینەوەکانیشدا راگەیاندراوە کە لە جیهانی سێیەم نەخوێندەواری لەنێو پیاوان تا ساڵی (٢٠٢٥) و لەنێو ژنانیشدا تا ساڵی (٢٠٤٠) بەردەوام دەبێت. ئەمەش واتە بەردەوامبوونی بازنەی دواکەوتن، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو پێشکەوتنە مەعریفیانەی جیهان بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام تائێستا پرۆسەی فێرکردن لە جیهانی سێیەمدا نەیتوانیوە گەشەپێدان بەدی بهێنن.

٣. **زانست و تەکنەلۆژیا:**

لەئێستادا جیهان پێشکەوتنێکی فراوانی لە بواری زانست و تەکنەلۆژیادا بەخۆوە بینیوە. بەشێوەیەك ئامارەکان وا نیشان دەدەن کە هەر پێنج ساڵێك ئەم پێشکەوتنە دەبێتە دوو ئەوەندە. هەروەها ئەم پێشکەوتنە تەکنەلۆژییە گەیشتۆتە جیهانی سێیەم، بەڵام بەهۆی

نەبوونی ئیرادەیەکی سیاسی دروست و گونجاو لەلایەن ئەو پارتە سیاسی و خێڵانەی فەرمانڕەوایی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەکەن نەتوانراوە بەرەوپێشچوونە زانستی و تەکنەلۆژییەکان لەپێناو بەدیهێنانی گەشەپێداندا تەرخان بکرێت.

٤. گەندەڵی:

گەندەڵی واتە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەپێناو بەرژەوەندییەکاندا، لەحاڵەتی نەبوونی یان لاوازبوونی دامەزراوەی سیاسی لەگەڵ لاوازی چاودێری لەلایەن کۆمەڵگەوە.

لەئێستادا لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بەشێوەیەکی فراوان دیاردەی گەندەڵی هەیە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرەدەسێنێ بەشێوەیەك حاڵەتێکی نوێ دروست بووە کەپێی دەوترێت (گەندەڵی ڕێکخراو-الفساد المنظم) کە پارتە سیاسییەکانیش بەشێوەیەکی بەرچاو تێوەی گلاون و بونەتە بەشێك لەو گەندەڵییە ڕێکخراوە. بەڵام باشترین چارەسەر بۆ ئەم حاڵەتە بریتیەلە:

أ. شەفافیەت لە کاری دەوڵەت و پارتی سیاسی و دامەزراوەکانیدا.

ب. فەرمانڕەواییەکی دروست و میتۆدییانەی زانستی لە بەکارهێنانی داهاتەکانی وڵات و پارت.

ج. لێپرسینەوەی یاسایی.

د. چاودێری گەل (ڕای گشتی و ڕاگەیاندن).

لە حاڵەتی جێبەجێکردنی ڕاستەقینە و ووردی ئەو خاڵانەدا بەرەنگاری گەندەڵی ئاسان دەبێت و دەتوانرێت کۆمەڵگەیەکی بەهێز

دروست بکرێت. بەتایبەت لە حاڵەتی جیاوازی کردن لەنێوان ئەرکی گشتی و بەرژەوەندی تایبەتی. هەروەها ئە ئەنجامدانی چاکسازی لە سیستەمی ئیداری و تێکڕای سیستەمی سیاسی بەشێوەیەك ئارامی و پرۆسەی گەشەپێدان بەدیبهێنن.

٥. بەشداری:

مافی بەشداریکردن ڕەگەزێکی سەرەکی بەدیهاتنی گەشەپێدانێکی دروستە. بەتایبەت بەشداریکردنی لاوان و ژنان. ئەرکی پارتی سیاسییە زەمینەی راستەقینە و لەبار بۆ ئەو بەشدارییە دروست بکات. بەڵام لە زۆرینەی وڵاتانی جیهانی سێیەم چەندین ڕێگر و ئاستەنگ هەیە لە بەردەم بەشداریکردندا جا ئەو ئاستەنگانە دەسەڵات و سیستەمی سیاسی دروستی بکەن یان کلتور و نەریتەکانی کۆمەڵگە دروستی بکەن.

لەم چەند ساڵەی دواییدا لە چەند ناوچەیەکی جیهانی سێیەم هەندێ هەنگاوی ئیجابی دەبینرێت لەپێناو هاندانی بەشداریکردندا لەپێش هەموو ئەو گۆڕانکاریانەش مەسەلەی دەستکاریکردنی یاساکانی تایبەت بە ئازادییە گشتییەکان و مافە سیاسییەکان و ڕێگەدان بەبوونی پارتە سیاسییەکان و ئازادی لە کارکردنیان، بەڵام ئەم هەنگاوە پێویستی بە هەوڵی فراوانتر هەیە.

بابەتی مافی مرۆڤ و گەشەپێدان و رۆڵی پارتی سیاسی لەو بوارەدا بە گرنگترین بابەتەکانی سەردەم دادەنرێ و بوەتە مەسەلەیەکی نێودەوڵەتی و لە زۆربەی کۆبوونەوە و لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە گەشەپێداندا بە گرنگیەوە باس دەکرێت. بەتایبەت دوای دەرچوونی (إعلان الحق في التنمية) لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ساڵی (١٩٨٦) وەکو هەنگاوێکی گرنگ لەم بوارەدا کە دروشمی سەرەکی بریتییەلە (مافی مرۆڤ نایەتەدی بەبێ گەشەپێدان، گەشەپێدانیش نایەتەدی بەبێ مافی مرۆڤ). لەپاڵ ئەم بەیاننامەدا چەندین بەیاننامەی تر هەیە وەکو (جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ ١٩٤٨) و (بەیاننامەی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان ١٩٦٦) و (جاڕنامەی هەزارە ٢٠٠٠) کە سەرجەمیان جەخت لەسەر مافی مرۆڤ و گەشەپێدان دەکەنەوە لە گشت بوارەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی. بەو پێیەی مافی مرۆڤ پەیوەستە بە گەشەپێدان و گەشەپێدانیش مافێکە دەبێت دەوڵەتان و سیستەم و پارتە سیاسیەکان پەیوەست بن پێوەی. ئەم مافەش واتە دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانێکی ئازاد کە لەڕێی چەند بابەتێکی تری پەیوەست بە مافی مرۆڤەوە دێتەدی، لەوانە:

١. رۆڵی سیستەمە سیاسیەکان لە بەدیهێنانی گەشەپێداندا.

٢. رۆڵی پارتە سیاسییە دەسەڵاتدار و ئۆپۆزسیۆنەکان لە بەدیهێنانی مافەکانی مرۆڤ، بەتایبەتی ماف لە گەشەپێدان.

٣. پرۆگرام و عەقڵیەتی پارتە سیاسییەکان لە کەمکردنەوەی هەژاری.

٤. هاندانی پرۆگرام و سیاسەتی پارتە سیاسییەکان بە ئاراستەی بەدیهاتنی مافەکانی ژنان.

٥. هاندانی پرۆگرام و سیاسەتی پارتە سیاسییەکان بە ئاراستەی بەدیهاتنی مافەکانی لاوان.

٦. هاندانی پرۆگرام و سیاسەتی پارتە سیاسییەکان بە ئاراستەی بەدیهاتنی مافەکانی منداڵان.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە گەشەپێدان تەنها بریتی نیە لە مافی تاك، بەڵکو سنوری گەشەپێدان لەوە زیاترە و دەکرێت لە چوار بواردا باس بکرێت ئەوانیش:

١. مافی تاك.
٢. مافی چارەی خۆنووسین.
٣. مافی ئاشتی.
٤. مافی دابینکردنی ژینگەیەکی تەندروست.

بەمشێوەیەش رۆڵی پارتە سیاسییەکان لە هێنانەدی گەشەپێدان و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ بووەهۆی سەرهەڵدانی چەمکێکی نوێ لە زانستی سیاسیدا کەپێی دەوترێ (فەرمانڕەوایی نوێ و گونجاو–الحکم الجدید و الجید) کە بریتیەلە شێوازی دابەشکردن و بەکارهێنانی دەسەلات بەشێوەیەك کە لە خزمەت راپەراندنی کاروبارە گشتییەکاندا بێت. بەمشێوەیە رێکخستنی کۆمەڵگا دەبێتە بوارێکی سەرەکی

گەشـــەپێدانی دەوڵـــەت و بوارەکـــانی ژیـــان بـــەرەو سیـــستەمێکی دامەزراوەیی ئاراستە دەکرێت.

هیچ پارتێکی سیاسی نیه له جیهاندا خۆی وەك داکۆکیکارێك له دیموکراسی نیشان نەدات. واته هەموو پارتێکی سیاسی خۆی به هێزێکی دیموکراسی دەزانێت و لەژێر پرۆگرام و بەرنامەی کاریدا بانگەشەی پابەندبوون به دیموکراسییەوە دەکات. بەڵام زۆرجار ئەوەی له واقعدا دەبینرێت جیاوازە لەوەی له دووتوێی نوسراوە تیۆرییەکاندا هەیە.

بۆ ئەوەی دڵنیابین له ئاستی دیموکراسی بوون یان دیموکراسی نەبوونی پارتێکی سیاسی له هەر کۆمەڵگەیەکدا پێویسته چەند ئاماژەیەك هەبێت. کاتێکیش پارتی سیاسی خۆی به هێزێکی دیموکراسی له قەڵەم دەدات ئەوا پێویسته کۆمەڵێك رەفتاری سەرەکی تێدا بێت، له گرنگترینیان:

١. دابەشکردنی دەسەڵات له ناوخۆی پارتی سیاسی:

بەوپێیەی پێویسته دەسەڵاتی پارتی سیاسی لەنێو ئۆرگانەکانی پارتەکەدا دابەشکرابێت. واته لەلایەن سەرکردەیەك یان گروپێکەوە به ئاراستەیەکی دیاریکراودا بەکارنەهێنرێت و قۆرخ نەکرێت. ئەمەش پەیوەندی به دوو بواری سەرەکییەوە هەیە، که بریتین له:

أ. پێکهاتەی رێکخستنی پارته سیاسییەکان:

ئەم پێکهاتەیە زیاتر پەیوەندی بەو بوارە رێکخستنەوە هەیە که پارتی سیاسی لەنێو پەیرەوی ناوخۆیدا دەیگرێتەبەر، که تیایدا

هەرەمی بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە پارتی سیاسییدا ڕێکخراوە. ئەگەر ئەو ڕێکخستنە ڕێکخستنێکی قۆرخکارانە بوو ئەوا لەو پارتە سیاسییەدا دیموکراسی دەکەوێتە ژێر گومانەوە. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ڕێکخستنی پارتی سیاسی ڕێکخستنێکی نامەرکەزییانە بوو ئەوا لەو پارتە سیاسییەدا پێشبینی بوونی دیموکراسی دەکرێت.

ب. پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری دەرەکی پارتە سیاسییەکان:

تیایدا دەبێ ئەوە روون بێت ئایا کێ بەشداری لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری دەرەکی پارتی سیاسیدا دەکات؟ بۆ ئەمەش چوار خاڵی گرنگ پێویستە لەبەرچاو بگیرێت کە بریتین لە:

- زانینی ڕاددەی بوون یان نەبوونی تاکڕەوی لەسەر ئاستی سەرکردایەتی پارتی سیاسی یان گروپێك یان کەسێك لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی.

- ڕاددەی بوونی کەناڵی جۆراوجۆر بۆ بەشداریکردنی ئاستەکانی ناوەڕاست و خوارەوەی پارتی سیاسی لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی.

- ڕاددەی هەڵوێستی ئاستەکانی خوارەوەی پارتی سیاسی لە بەرامبەر قۆرخکردنی دروستکردنی بڕیاری سیاسی لەلایەن سەرکردە یان سەرکردایەتییەوە.

- ڕاددەی گوێگرتن و گرنگیپێدانی ئاستەکانی سەرەوەی پارتی سیاسی بەو هەڵوێست و ناڕەزاییانەی ئەندامانی پارتە سیاسییەکە لە ئاستەکانی خوارەوە هەیانە.

٢. چۆنێتی یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییەکان لەنێو ئەندامانی پارتی سیاسییدا:

ئەو ناکۆکیانەی لەنێو پارتە سیاسییەکاندا سەرهەڵدەدات پێویستی بە یەکلاکردنەوەی زانستییانە هەیە کە پشتبەستوو بێت بە کۆمەڵێك بنەمای حزبی کە هەموو ئەندامانی پارتی سیاسی لەسەری رێککەوتون. لێرەشدا پێویستە لە چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانەدا کۆمەڵێك خاڵی گرنگ لەبەرچاو بگیرێت لەوانە:

- ئایا ئەم ناکۆکییە پەیوەندی بە پرسێکی کورتی دیاریکراوەوە هەیە یان مەسەلەیەکی درێژخایەنە؟
- ئایا لایەنە ناکۆکەکان تەنها لە چەند خاڵێکی دیاریکراودا ناکۆکن یان ناکۆکییەکان زۆرن و قوڵبونەتەوە؟
- ئایا لایەنە ناکۆکەکان بچوکن یان گەورەبوون و بونەتە باڵ و کوتلەی جیاواز لەنێو پارتی سیاسییدا؟
- ئایا ناکۆکییەکان لەسەر ئاستی ناوچەیەکی دیاریکراوە یان فراوانە و هەموو ئاستەکانی وڵات لەو پارتە سیاسییەدا دەگرێتەوە؟
- ئایا ئەو ناکۆکییانە پەیوەندی بە بابەتی فکرییەوە هەیە یان پەیوەندی بە پرسێکی ئیداری دیاریکراوەوە هەیە؟
- ئایا میکانیزمی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان میکانیزمی دیموکراسین یان دیکتاتۆرییانە چارەسەرێکی دیاریکراو دەسەپێنن؟

چەمكی كۆمەڵگەی مەدەنی مێژوویەكی فراوانی هەیە و بەشی زۆری بیرمەند و فەیلەسوفەكان بۆچوونی تایبەتی و زانستیان لە بارەیەوە پێشكەش كردووە، ئەم باسكردنە ڕێگە خۆشكەرێك بووە بە ئاراستەی ئەنجامدانی چەندین لێكۆڵینەوەی تیۆری-زانستی لەبارەی چەمكی كۆمەڵگەی مەدەنی، بەجۆرێك ئەم لێكۆڵینەوانە لەدەرەنجامدا فرەبۆچونیەكی لەبارەی ئەم چەمكەوە بەدیهێناوە.

لە گرنگترین ئەو بۆچونانەی لەبارەی چەمكی كۆمەڵگەی مەدەنییەوە پێشكەشكراوە بریتیە لە بۆچونی (ئەرستۆ) كە دەڵێت: (كۆمەڵگەی مەدەنی بریتیەلە كۆمەڵێكی سیاسی كە ملكەچی كۆمەڵێك یاسان). ئەم بۆچونەی (ئەرستۆ) هەرچەندە مێژوویەكی كۆنی هەیە، بەلاّم تاڕاددەیەكی باش چەمكی كۆمەڵگەی مەدەنی چڕكردۆتەوە لە كۆمەڵگەیەكدا كە تاكەكانی پابەندن بەو یاسایانەی لەو كۆمەڵگەیەدا هەیە كە تیایدا دەژین.

لەلایەكیترەوە (ئەنتۆنیۆ گرامشی) پێی وایە (كۆمەڵگەی مەدەنی گۆڕەپانی كێبركێی ئایدیۆلۆژیەكانە). هەرچەندە ئایدیۆلۆژیا كاریگەرییەكی فراوانی هەیە لەسەر كۆمەڵگە و سەرجەم ئەو پێكهاتە سیاسی و ئابوری و كۆمەڵایەتی و فەرهەنگیانەی كە لەم كۆمەڵگەیەدا هەیە، بەلاّم تاڕاددەیەكی فراوان ناكرێت ئایدیۆلۆژیا تەنها هۆكاری داڕێژەری سیاسەت و دەوڵەت و كۆمەڵگەی مەدەنی بێت.

هەروەها چەند پێناسەیەكی تر بۆ چەمكی (كۆمەڵگەی مەدەنی) كراوە لەوانە: (كۆمەڵگەی مەدەنی ئەو كۆمەڵگەیەیە كە تاڕاددەیەكی زۆر دوورە لە سەرپەرشتی دەوڵەت). یان (كۆمەڵگەی مەدەنی ئەو

کۆمەڵگەیەیە کە لەسەر بناغەی بوونی دەزگا و دامەزراوەی سیاسی و ئابوری و کۆمەلآیەتی و فەرهەنگی بنیاتنراوە و کاردەکات لەپێناو بەدیهاتنی چەند ئامانجێکی مرۆیی). هەروەها (کۆمەڵگەی مەدەنی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە بەتەواوی رۆڵی دەسەلآت وەلادەنێت و رۆڵی کۆمەڵگە زاڵ دەکات بەسەر رۆڵی دەوڵەتدا). یان (کۆمەڵگەی مەدەنی رێکخراوی خۆبەخشی ئازادە، ئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە کە لە نێوان خێزان و دەوڵەتدا هەیە، بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی تاکەکانی کۆمەڵگە، بەمەرجێك ئەو هەولآنە پابەندبن بە بەها و پێوەرەکانی رێزگرتن و لێبووردەیی و بەڕێوەبردنێکی دروست). کەواتە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە: (کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵێك رێکخستنی خۆبەخشانەیە، کاردەکەن لەپێناو پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لەنێوان خێزان و دەوڵەتدا هەیە، بە مەرجێك ئەو هەولآنە لە رێی چالاکی مرۆییەوە بن).

- **رەگەزەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی:**

گرنگترین رەگەزەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بریتیەلە:

۱. **رێکخستن:**

کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵە ئەرکێکی دیاریکراوی لەئەستۆدایە ناتوانێت ئەو ئەرکانە بەجێبهێنێت بەبێ بوونی رێکخستنێکی پتەو و راستەقینە. رەگەزی رێکخستن رۆڵێکی سەرەکی و گرنگی هەیە لە ژیانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا. بە بەهێزی رێکخستن دەتوانرێت رێژەی سەرکەوتنی کۆمەڵگەی مەدەنی دیاری بکرێت، ئەمەش واتە

بەدامەزراوەییکردنی ژیانی مەدەنی لە گشت بوارەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و....هتد.

### ٣. خۆبەخشی:

مەبەست لە خۆبەخشی واتە بەشداریکردنی ئارەزوومەندانە و بەبێ زۆرەملێ لە کارکردن بە ئاراستە مەدەنیەکاندا و دوور لە هەر جۆرە زۆرلێکردنێك. بەم پێیە پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لەم ڕێگەیەوە لە پێکهاتە زۆرەملێکانی تر جیادەکرێنەوە.

هــزری خۆبەخـشی بەسـتراوە بــە چـەندین چـەمکی تـری ژیـانی مرۆڤایەتیەوە کە سەرجەم چەمکەکان ژیانێکی مەدەنی لە کۆمەڵگەدا دروســت دەکــەن. بــەجۆرێك تیایــدا مرۆڤــەکان خۆشــبەختی و خۆشگوزەرانی گشتی بەرهەم دەهێنن و لەناو هزری مرۆییدا دەیچێنن.

### ٤. سەربەخۆبوون و بێ لایەنی:

پێویـستە تاڕاددەیـەکی فـراوان پێکهاتـەکانی کۆمەڵگـەی مـەدەنی دووربـن لەهــەر شـێوازێکی لایـەنگیری کـردن بـۆ دەسـەڵات، چـونکە لەڕاستیدا ئەو پێکهاتانە ڕێکخەری پەیوەندی نێوان تاك و دەسەڵاتن، بە لایەنگیریان بۆ دەسەڵات لە پەیام و ئەرکی سەرەکی خۆیان لادەدەن. کە نوێنەرایەتیکردنی تـاك و خێـزان و هاوڵاتیانـە لەبـەردەم دەسـەڵاتی سیاســی و گەیانــدنی خواسـتە مەدەنییــەکانی ئەوانــە بــۆ بــەردەم دامـەزراوەکانی دەوڵـەت و وەرگرتنـەوەی وەڵامـی دەوڵەتیـشە بـۆ ئـەو

هاولاّتی و گروپانە. واتە رۆلّی گەیەنەرێکی مەدەنی دەبینێت لەنێوان خەلّك و دەسەلاّتدا.

لە هەندێ حالّەتدا بێ لایەنی گرنگترە لە سەربەخۆبوون، بەوپێیەی رێکخراوەکانی کۆمەلّگەی مەدەنی هەلّگری هەر ئایدیا و هزر و ئایدیۆلۆژیایەك بن، دەبێت لە ئەنجامدانی چالاکیە مەدەنیەکاندا بێ لایەنی خۆیان بپارێزن، چونکە چالاکیەکان چالاکی مرۆیین، واتە بۆ سەرجەم مرۆڤەکانە.

### ٥. هەولّنەدان بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت:

ئامانجی کۆمەلّگەی مەدەنی گەیاندنی دەنگی تاکەکانی ئەو کۆمەلّگەیەیە بە دەسەلاّتی سیاسی و ئابووری و کلتوری و کۆمەلاّیەتی ئەو کۆمەلّگەیە، کەواتە کارکردنی ئەو کۆمەلّگەیە لەسەر دوو رەهەندی سەرەکییە ئەوانیش (تاك) و (دەسەلاّت)ن. ناکرێت کۆمەلّگەی مەدەنی هەولّ بدات بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت چونکە بواری کارەکانی تەسك دەکاتەوە و رەهەندێکی سەرەکی کارکردنی لەدەست دەدات.

ئەم رەگەزەی کۆمەلّگەی مەدەنی پێچەوانەی پارتی سیاسییە، چونکە پارتی سیاسی هەولّدەدات بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت و لەوێوە بنەما و پرەنسیپە سەرەکییەکانی خۆی دەچەسپێنێت. بەلاّم کۆمەلّگەی مەدەنی نابێتە بەشێك لە دەسەلاّت بەلّکو هێزی گەیەنەرە لەنێوان تاك و دەسەلاّتدا.

- **پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی:**

کۆمەڵگەی مەدەنی چەندین پێکهاتەی سەرەکی تێدایە کە هەریەکەیان بایەخ و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەو بوارەی کاری تێدا دەکات، لە گرنگترین ئەو پێکهێنەرانەش:

١. گروپە کۆمەڵایەتیەکان
٢. سەندیکا
٣. سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە
٤. زانکۆ و پەیمانگاکان
٥. میدیا سەربەخۆکان
٦. سەنتەرەکانی لاوان و خوێندکاران و ژنان
٧. یانە وەرزشی و هونەرییەکان
٨. رێکخراوەکانی تری کۆمەڵگەی مەدەنی

هەریەك لەم پێکهێنەرانە لە بواری خۆیدا دەتوانێت رۆڵ و کاریگەری لەسەر بەرەوپێشبردنی ئاستی کۆمەڵگەی مەدەنی بگێرێت، بەم رۆڵەش رادەی بەهێزی ئەو کۆمەڵگەیە دەردەکەوێت.

- **ئاستەکانی کارکردنی پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی:**

کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر چەند ئاستێك کاردەکات لە گرنگترینیان:

**١. ئاستی سیاسی:**

کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر ئاستی سیاسی رۆڵێکی گرنگی لە ئەستۆدایە کە دەبێت چاودێرێك بێت بەسەر ژیانی سیاسی گشتی کۆمەڵگەوە و کاریگەری خۆی لەسەر ئەو بوارە دەربخات و لێنەگەرێت

دەوڵەت تاك لایەنە مامەڵە بە سیاسەتی گشتی وڵاتەوە بکات لە هەموو بوارە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانەوە.

٣. ئاستی ئابووری:

ئابووری بەشێکی سەرەکیە لە ژیانی مرۆڤایەتی، بەشێوەیەك کە بە شێك لە بیرمەندان پێیان وایە ئابووری دیوی دووەمی سیاسەتە و ناکرێت سیاسەت درێژەی پێ بدرێت بەبێ بونی ئابوورییەکی بەهێز. لێرەشدا سەلماندنی هێزی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ بەئاگابوون لە سیاسەتی ئابووری کۆمەڵگە ئەرکێکە لە ئەستۆی پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدایە و دەبێ بەوپەڕی بەرپرسیارێتیەوە کار لەسەر بواری ئابوری بکەن و نەیەڵن لایەنێکی دیاریکراو لە دژی هاوڵاتیان قۆرخی بکات.

٤. ئاستی ئایدیۆلۆژی:

لەبەرئەوەی ناتوانرێت بەشێوەیەکی سەرەکی ئایدیۆلۆژیا لە ژیانی مرۆۆ دابڕرێت، هەربۆیە کارکردن لەسەر ئاراستەکردنێکی ئیجابیانەی ئەو ئایدیۆلۆژیایە و کەمکردنەوەی کاریگەرییە سلبیەکانی، دەبێتە بوارێکی فراوان بۆ کارکردنی پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، بە تایبەت لەو کۆمەڵگایانەی ئایدیۆلۆژیا رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت.

٥. ئاستی کلتووری–کۆمەڵایەتی:

کلتوری کۆمەڵگە و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکەی کاریگەری لەسەر داڕشتن و پیادەکردنی ژیانی گشتی لەو کۆمەڵگەیەدا هەیە.

دیاریکردنی خاڵی ئیجابی و سلبی ئەو سیستەمە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیە و دواتر کار لەسەرکردنی، یەکێکە لەو ئاستانەی کە کۆمەڵگەی مەدەنی ئیشی لەسەر دەکات.

- **تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی:**

مەبەست لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی واتە تایبەتمەندییەکانی پێکهاتە و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی. هەریەك لە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لەڕووی ئاستی پێشکەوتن و چالاکی و رێکخستنەوە لە یەکتر جیاوازن، ئەم جیاوازییانەش چەند تایبەتمەندییەکی سەرەکی بە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەخشیوە، لە گرنگترینیان:

1. **توانای خۆگونجان:**

مەبەست لە توانای خۆگونجان بریتیەلە بەهێزی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ بەرەوپێشچونەکانی ئەو ژینگەیەی کە کاری تێدا دەکات. بەشێوەیەك هەتا توانای دامەزراوەکە لە خۆگونجاندن زیاتر بێت، ئەوا ئەو دامەزراوەیە دەتوانێت چالاکانەتر کارەکانی ئەنجام بدات. توانای خۆگونجانیش چەند جۆرێکی هەیە کە بریتین لە:

أ. خۆگونجان بە پێی کات:

واتە توانای دامەزراوەکە لە بەردەوام بوونی بۆ کاتێکی دوورودرێژ، چونکە هەتا مانەوەی دامەزراوەیەك زیاتر بێت، توانای کارکردنی رێکخراوەیی زیاتر دەبێت.

ب. خۆگونجان بە پێی نەوە:

واتە توانای دامەزراوە و دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ خۆگونجاندنی لەگەڵ نەوە و هێزە یەك لەدوای یەکەکان، جا لە ناوخۆی دامەزراوەکە بێت یان لە دەرەوە. هەتا توانای خۆگونجانی دامەزراوەکە لەگەڵ نەوە نوێکاندا زیاتر بێت، ئەوا توانای کارکردنی رێکخراوەیی ئەو دامەزراوەیە بەهێزتر دەبێت. لەڕاستیدا نەوەکان بە پێی کات و شوێن گۆرانکاری سەرەکییان بەسەردادێت، بە تایبەت لەسەر ئاستی بیرکردنەوەی سیاسی و کلتوری و کۆمەڵایەتی و ئابووری.

پ. خۆگونجان بە پێی کاروبار:

مەبەست لێی توانای دامەزراوەکەیە بۆ خۆگونجان لەگەڵ پۆست و ئەرکە جیاوازەکانی کۆمەڵگە، لە ناوخۆی رێکخراوەکە بێت یان لە دەرەوەی. هەندێجار ئەم شێوازەی خۆگونجان تەنها پێویست بە ئەنجامدانی هەندێك گۆرانکاری لاوەکی دەکات لە چۆنێتی بەرەوپێشبردنی کاروبارەکانی ناوخۆی ئەو دامەزراوەیە.

٢. سەربەخۆبوون:

سەربەخۆبوون واتە دووركەوتنەوەی دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی لە ملكەچی و پاشكۆیەتی هیچ هێز و لایەن و كۆمەڵ و تاكێكی تر كە زیان بە پەیام و كاركردن و ڕێكخستنیان بگەیەنێت. بەجۆرێك ئەو دامەزراوەیە لە پەیامی سەرەكی خۆی لابدات.

سەربەخۆبوونیش لە چەند بوارێكدا پێوستە:

أ. دروستبوونی دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی:

لەڕاستیدا پێویستە ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی ئاستێكی فراوان لە سەربەخۆبوونیان تیادا هەبێت. بەتایبەت لە كاتی دروست بوونیاندا، چونكە هەر دەستێوەردانێكی دەرەكی لە شێواز و سیاسەتی دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی هەر لەسەرەتاوە بەڵگەیە لەسەر لاوازی بەرهەمی داهاتووی ئەو ڕێكخراوە. هەر دەستێوەردانێكی دەرەكیش واتە پاپەندبوون بە كۆمەڵێك ئەرك و ئیلتیزاماتی دەرەكی كە لە ئەنجامدا كاریگەرییان لەسەر چالاكی و ڕۆڵی ئەو دامەزراوەیە دەبێت.

ت. سەربەخۆیی دارایی:

بۆ دروست بوون و كاركردنی هەر ڕێكخراوێكی كۆمەڵگەی مەدەنی دارایی و ئابوورییەكی تاڕاددەیەك بەهێز پێویستە. ڕێژەی پێویستی ئەم داراییەش لە ڕێكخراوێكەوە بۆ ڕێكخراوێكی تر دەگۆڕێت. زۆرجار ئەو كەسەی هاوكاری دارایی بۆ كارێك دابین دەكات دەبێتە خاوەنی بڕیار و دەتوانێت عەقڵیەتی خۆی بەسەر پەیام و شێوازی ئەو كارە

بسەپێنێت. هەربۆیە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی پێویستیان بە خۆپاراستنە لە سەپاندنی رای دەرەکی بەسەریاندا، کە دەرەنجامەکەی نەگەیاندنی پەیامەکەیە وەکو خۆی و نەهێشتنی راددەی زانستیبوون و بێ لایەنی لە ئەنجامدانی کارەکان.

**پ. سەربەخۆیی لە کاروبار و ڕێکخستن:**

واتە توانای دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە بەڕێوەبردنی کاروبارە ناوخۆییەکان بەپێی پەیڕەوی ناوخۆ و بڕیار و ڕاسپاردە و یاساکانی ڕێکخراوەکە و دوور لە دەستتێوەردانی دەرەکی، جا ئەم دەست تێوەردانە لە لایەن دەوڵەتەوە بێت یان لە لایەن هێز و لایەنێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری.

**٣- فراوانی لە بڵاوبونەوەدا:**

پێویستە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئاستی کارکردنی جوگرافیان فراوان بێت و بتوانن زۆرترین ڕێژەی خەڵك بگرنەوە. لێرەدا پێویستە ڕێکخراوەکە زۆرترین بنکەی فەرعی و ئۆفیسی ناوچەیی هەبێت تا بتوانێت کارەکانی فراوان بێت. بۆ بەدیهێنانی ئەم حاڵەتەش دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی پێوستیان بە داڕشتنی پێکهاتەیەکی ڕێکخراوەیی گرنگ هەیە.

**٤. هاوتابوون:**

هاوتابوون واتە نەبوونی ململانێی ناوخۆیی لە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا، چونکە هەر ململانێ و کێشەیەکی ناوخۆیی

بەشێوەیەکی سلبی کاردەکاتە سەر پەیام و کاری ڕێکخراوەکە و سەرقاڵی دەکات بە چەند بابەتێکی لاوەکی کە هیچ پەیوەندی نیە بەو سیاسەتانەی دامەزراوەیەکی کۆمەڵگەی مەدەنی بانگەشەی بۆ دەکات.

- **کۆمەڵگەی مەدەنی و پارتی سیاسی:**

لە تێگەیشتن لە بابەتی کۆمەڵگەی مەدەنی و گرنگترین ئەو بوارانەی پەیوەندی هەیە بە پێناسە و پێکهێنەر و تایبەتمەندی و بوارەکانی کارکردنی کۆمەڵگەی مەدەنیەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پارتی سیاسی وەك یەکێك لە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئەژمار دەکرێت. بەوپێیەی کە پارتی سیاسی هاوشێوەی هەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ڕەگەزەکانی ڕێکخستن و جەماوەر و سەربەخۆیی و پرەنسیپ و سەرکردایەتی تێدایە، بەڵام ئەوەی پارتی سیاسی لە ڕێکخراو و دەزگا و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی جیادەکاتەوە بریتیەلە هەوڵدانی پارتی سیاسی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و بەشداریکردنی لە ململانێی سیاسی و ئیداری نێو کۆمەڵگە، بەڵام بەپێچەوانەوە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵات نادەن و تەنها دەنگ و هێزی گەیەنەری نێوان تاك و دەوڵەتن.

* **چەمکی ڕای گشتی:**

ڕای گشتی لە هەردوو وشەی (ڕا) و (گشتی) پێکهاتووە. ووشەی (ڕا) بریتیەلە هەڵوێستێك یان ئاڕاستەیەك یان تێڕوانین و بیروباوەڕێك. یەکێکە لە بەرهەمەکانی عەقڵی مرۆڤ و بەئاشکرا بێت یان بە شاراوەیی مرۆڤ لەڕێی وشە یان وێنە یان جوڵە یان بینین گوزارشتی لێ دەکات.

ئەگەر ئەو ڕایە تایبەت بوو بە بوارێکی تایبەتی تاکەوە ئەوا پێی دەوترێت (ڕای تایبەت). بەلاَم ئەگەر پەیوەندی بە بەرژەوەندی و چارەنووسی گروپەوە هەبوو ئەوا پێی دەوترێت (ڕای گشتی). ئەو گشتییەی کە لە ڕای گشتیدا هەیە گوزارشتە لە گروپ یان کۆمەڵ، کە کۆمەڵێك ڕەگەزی هاوبەش پەیوەندییەکانیان ڕێکدەخات، ئەمەش پێویستی بە بەشداری کردنی تاك هەیە.

لەبارەی ڕای گشتییەوە چەندین پێناسەی جیاواز هەیە لە گرنگترینیان پێناسەی بیرمەند (ئەلفرێد سۆفی) کە دەڵێت: (ڕای گشتی بریتیەلە ڕای ویژدانێکی هەستیار کە لە شێوەی دادگایەکدا گوزارشت لە دەنگی شاراوەی خەڵك دەکات). هەروەها (جۆن ستیوارت میل) پێی وایە (ڕای گشتی بریتیەلە هەموو ئەو شتانەی کە کۆمەڵگا دەیەوێت یان نایەوێت). بەلاَم (دکتۆر ئەحمد بەدر) دەڵێت (ڕای گشتی بریتیەلە گوزارشتکردن لە ڕای دەنگدەران بەشێوەیەکی جیاوازتر سەبارەت بە پرسە گشتییەکان کە ناکۆکیان لەسەرە). لەلایەکیترەوە بیرمەند (دێڤێد پێسۆن) پێی وایە (ڕای گشتی بریتیەلە ڕای ژمارەیەکی زۆر لەو تاکانەی کە مەرج نیە یەکتر بناسن بەلاَم وەلاَمێکی هاوبەشیان هەیە سەبارەت بە ڕووداوێکی دیاریکراو). هەوەها (داڤید ترومان) دەڵێ (ڕای گشتی بریتیەلە ڕای کۆمەڵێك لە تاکەکان کە جەماوەر پێکدەهێنن و

گفتوگۆ لەسەر پرسێکی دیاریکراو دەکەن، ئەمەش هەموو تاکەکان ناگرێتەوە بەڵکو تەنها ئەو تاکانە دەگرێتەوە کە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە).

بەشێوەیەکی گشتی رای گشتی بریتیەلە رای کۆمەڵ یان گروپێك کە چەند ڕەگەزێکی هاوبەندی ئاڵوگۆڕ سەبارەت بە پرسێکی دیاریکراو کۆیان دەکاتەوە. کە ئەو پرسە پەیوەندی بە بەرژەوەندی و چارەنووسی ئەو گروپەوە هەیە. یان بریتیەلە دەزگایەکی ڕاوەرگرتن سەبارەت بەو پرسانەی کە تایبەتن بە گروپێك.

بەم جۆرە لە ڕای گشتیدا سێ ڕەگەزی سەرەکی هەیە:

١. گروپ یان کۆمەڵ.
٢. بابەت یان پرس.
٣. هەڵوێست.

- **مێژووی ڕای گشتی:**

لە سێ بوارەوە تەماشای مێژووی ڕای گشتی دەکرێت کە بریتین لە :

١. رای گشتی وەکو چەمکێك.
٢. رای گشتی وەکو دیاردەیەك.
٣. رای گشتی وەکو بابەتێکی زانستی.

ڕای گشتی وەکو چەمك لە سەدەی هەژدە و لەکاتی شۆڕشی فەرەنسی و لە سەردەمی لویسی شانزەیەمین بۆ یەکەمینجار لەلایەن وەزیری دارایی فەرەنساوە بەکارهات وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو خاوەن

سەرمایانەی کە قەرزیان دەدایە حکومەت، بەلاّم ئەم وەزیرە پێشنیاریکرد کە چەکی پارەی ئەو سەرمایەدارانە لە بانکەکاندا بەناوی رای گشتییەوە تۆمار بکرێت.

بەلاّم مێژووی ڕای گشتی وەکو دیاردە زۆر کۆنە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دروست بوونی مرۆڤایەتی کاتێك لە کۆمەڵگەکاندا چەند ناوێکی جیاواز لە جیاتی ڕای گشتی بەکار دەهات وەکو (ڕای زۆرینە، ڕای جەماوەر، ڕای گەل، دەنگی گەل، ڕێکەوتنی گشتی، ئیرادەی گەل،....هتد). بەردەوام باس کردن لە ڕای گشتی وەکو دیاردە لەلای فەیلەسوف و بیرمەند و پیاوانی دەوڵەت بە ئاشکرا و بە شاراوەیی هەبووە وەك ڕێگایەك بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی لەنێوان فەرمانڕەوا و جەماوەر.

لەڕاستیدا ڕای گشتی وەك دیاردەیەکی کۆمەلاّیەتی پەیوەستە بە کۆمەڵەوە و بە پێی بارودۆخە کۆمەلاّیەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگیەکان و بەپێی قۆناغە مێژووییەکان گۆڕانی بەسەردا دێت.

**ڕای گشتی چەند تایبەتمەندییەکی گشتی هەیە:**

١. تایبەتمەندی مێژوویی.
٢. تایبەتمەندی گروپی.
٣. تایبەتمەندی گفتوگۆکردن.
٤. تایبەتمەندی هەمەجۆری.
٥. تایبەتمەندی گۆڕانکاری.
٦. تایبەتمەندی پێوانە کردن.
٧. تایبەتمەندی پەیوەندی کردن.

**بەرەو پێشچوونی ڕای گشتی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕبووە کە بریتین لە:**

**ڕای گشتی لە سەردەمی (یۆنان)دا:**

نووسینەکانی هەریەك لە ئەرستۆ و ئەفلاتون سەرەتایەکی سادەن بۆ دیاردەی ڕای گشتی. بەتایبەت کە لە نووسینەکانیاندا باس لە دیموکراسیەت و بەشداری هاوولاتیان و ملکەچی بۆ یاسا دەکەن. بواری گشتی یەکێکە لەو بوارە سەرەکییانەی کە گرنگییەکی فراوانی لای یۆنانیەکان پێدرابوو. بەلام لەژێر چەند ناوونیشانێکی جیاوازدا وەکو (ڕای هاولاتی، ڕای ئازادەکان، ڕای زۆرینە).

1. **ڕای گشتی لە سەردەمی (ڕۆمانەکان)دا:**

لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەنگی خەڵك یان دەنگی جەماوەر سەری هەڵدا. کە گوزارشت بوو لەو ڕا باوانەی لەنێو خەڵکدا هەبوو لەڕێی پەیوەندییە تایبەتیەکان و بەرەوپێشچوونی بیناسازی و ڕێگاوبانەوە ئالوگۆڕ دەکران. لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەزگایەکی تایبەت بە وەرگرتن و زانینی ڕای گشتی دروست بوو لەژێر ناوی (هەواڵ گوێزەرەوە) کە لەڕێی نوسین و بلاوکراوەوە هەولیان دەدا ڕای گشتی بزانن، بەلام لە ژێر ناوونیشانی (ڕێکەوتنی گشتی یان هەستی بە کۆمەڵ) و ئەم چەمکە بەردەوام بوو تا سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحی.

2. **ڕای گشتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا:**

سەبارەت بە سەدەکانی ناوەڕاستی عەرەبی و ئیسلامی ئەم دیاردەیە لەژێر چەندین ناوی جیاوازی نزیك لە ڕای گشتییەوە بەکارهاتووە

وەکو (أهل الحل و العقد، شورا). ئەمەش لە تێکستە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) وەرگیراوە. هەندێك لە نوسەرانیش پێیان وایە ڕای گشتی لەئیسلامدا بریتیەلە (کۆدەنگی). بەلاّم لە ئەوروپا ڕای گشتی وەکو دیاردەیەکی کۆمەلاّیەتی دەرنەکەوت ئەویش بەهۆی هەژمونی کلێسای ڕۆمانی و ئەو ڕێسا ئاینیانەی لەو کایەدا زالّ بوون. بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەندێك نوسینی لاتینی لەم بوارەدا لە سەدەکانی ناوەراستدا بەدی دەکرێت لەژێر ناوی (Opinio publica).

### ٣. ڕای گشتی لە سەردەمی ڕۆشنگەری:

لە سەدەی پانزەوە بەئاشکرا هەست بە دەرکەوتنی پرۆسەی پێکهێنانی ئامێری چاپ کردن لە لایەن (گۆتەنبێرگ)و دەرکەوتنی بزوتنەوەی پرۆتستانتی ڕیفۆرمخواز و کێبڕکێکردنی لەگەلّ دەسەلاّتی کاسۆلیکی ڕۆمان. ئەم بزوتنەوەیە جەختی لەسەر تاك و هونەر و ئەدەب و زانستەکان و دژایەنی چەمکە ئاینیە قۆرخکەرەکان دەکردەوە. بیرمەندانی وەکو (بلێر باسکالّ، ڤۆلّتیر، تۆماس هۆبز، جۆن لۆك، ژان ژاك ڕۆسۆ، ئالفرێد بێرگ، هیگلّ) لەم سەردەمەدا سەرەتایەکیان بۆ ڕای گشتی بنیادنا.

### ٤. ڕای گشتی لە سەدەی نۆزدە:

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە چەمکی ڕای گشتی پێگەیەکی نویّ و بەهێزی لە تیۆری سیاسی دا بەدەست هێنا بەتایبەت لە نێوەندە لیبرالّی و پێشکەوتنخوازەکاندا کە پێیان وابوو ڕای گشتی دیاردەیەکی کۆمەلاّیەتی بەهێزە و کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسی هەیە.

پێشکەوتنخوازەکان پشتیان بە تیۆری (المنفعی-سودگەرایی) دەبەست کە (جیرمی بێنتام) دای هێناوە و بە کورتی بریتیەلە (بەدەست هێنانی زۆرترین خۆشگوزەرانی بۆ زۆرترین رێژەی خەڵك).

لەم سەردەمەدا تێکەڵەیەك لە چەمکەکانی رای گشتی و یاسا و سەروەری رویدا. بەڵام بیرمەندانی وەکو (جۆن تایلەر، جۆن ئۆستن، فرانسیس لیبەر) چارەسەری ئەم تێکەڵیەیان کرد و دەرئەنجامەکەی لە سەدەی بیستەمدا بەڕوونی دەرکەوت.

**٥. رای گشتی لە سەدەی بیستدا:**

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا نوسینەکانی هەریەکە لە (گابرێل تارد، گراهام والآس، ئارپەر کریستن) کاریگەری فراوانی هەبوو لەسەر دیاردەی رای گشتی. بەجۆرێك کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر رای گشتی دەکرد لەرێگەی لێکۆڵینەوە لە دامەزراوە دەستوری و سیاسییەکان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە. بەتایبەت ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠ کە سەرەتایەکی راستەقینەی نویٚ دەستی پێکرد بۆ لێکۆڵینەوە لە دیاردەی رای گشتی بەمەش لە زانکۆکاندا وەك وانەیەکی زانستی دەخوێندرا.

**دیارترین ئەو بوارانەی کە بۆ لێکۆڵینەوە لە رای گشتی لە سەدەی بیستەمدا بەکار دەهات بریتی بوو لە:**

أ. ریکلام و راگەیەندراوە بازرگانیەکان.

ب. هۆکارەکانی راگەیاندن.

ج. گروپەکانی فشار.

د. سەرکردایەتیەکان.

هـ. ڕای گشتی لە لێکۆڵینەوە و سەرژمێریەکان.

لـەماوەی نێـوان ١٩٣٠–١٩٤٠ گرنگـی ڕای گـشتی لـە پەیوەنـدی نێودەوڵەتیدا بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی پێشوو زیادی کرد. بەتایبەت لەگەڵ بڵاوبونەوەی ڕادیۆ وەك ئامرازێکی پەیوەندیکردن لەنێوان هێز و دەوڵـەت و لایەنـەکان. لـەدوای جـەنگی جیهـانی دووەم ڕای گـشتی لـە چەند بوارێکدا دەرکەوت:

أ. فراوانبوونی بابەتی ڕای گشتی وەك بابەتێکی زانستی لە زانکۆ و پەیمانگاکان و پەیدابوونی پسپۆڕ لەم بوارەدا.

ب. زیـادبوونی گرنگـی لێکۆڵینـەوە دەرونییـەکان لـە پێکهێنـانی ڕای گشتیدا.

ج. دەرکـەوتنی گرنگـی ڕای گـشتی لـە سیاسـەتی نێودەوڵەتیـدا بەتایبەتی لە بوارەکانی (ریکلام و هێرشکردنەسەر لایەنە جیاوازەکان).

د. بـەکارهێنانی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن بـۆ ئامـادەکردنی لێکۆڵینەوەکان لە بواری ڕای گشتیدا.

هـ. دروسـتبوونی پەیوەندییـەکی بـەهێز و گـشتی لـەنێوان دامەزراوەکانی دەوڵەت و ڕێکخراوەکان و دەستەکان.

٦. ڕای گشتی لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەوە تائێستا:

بـەهۆی کەڵەکـەبوونی گرنگـی ڕای گـشتی لـە سـەردەمەکانی پێشووترەوە بابەتی ڕای گشتی وەکو یـەکێك لە گرنگترین دیاردەکانی

پەیوەندیدار بە کۆمەڵەوە دەرکەوتووە. ئەم گرنگیەش لە سەدەی بیست و یەکەمدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار:

أ. شۆڕشـــی تەکنـــەلۆژی و زانـــستی، بەتایبـــەتی لـــە بوارەکـــانی گواستنەوە و پەیوەندی کردن.

ب. بلاوبونـــەوەی فێرکـــردن لـــە ســـەرجەم ئاســـت و ســـەرجەم دەوڵەتەکاندا.

ج. فراوانبوونی بەشداری خەڵك لە ژیانی گشتی بەتایبەتی لە بواری سیاسیدا.

- **جۆرەکانی ڕای گشتی:**

ڕای گشتی چەند جۆرێکی هەیە، بریتین لە:

**یەکەم: (ڕای گشتی بە پێی کات):**

ئەمیش سێ جۆرە:

**١. ڕای گشتی هەمیشەیی:**

ڕای گشتی هەمیشەیی پشت بە بنەمای مێژوویی و کلتوری و ئاینی دەبەستێ کە تیایدا هەموو تاکەکان هەست بە ئارامی و نەگۆڕی دەکەن نەوە لە دوای نەوە. ڕووداو و بارودۆخە کتوپڕەکان زۆر بە دەگمەن کاری تێدەکەن. لە گرنگترین ڕەگەزەکانی بریتین لە (ئاین و بیروباوەڕ و دابونەریت). ئەم ڕا گشتییە هەمیشەییە بەرهەمی ئەزموونی تاکەکان و تێکەڵاوبوونیانە لەگەڵ کۆمەڵگەکانیاندا. لەبەرئەوە ئەم ڕایە بەهێز و قوڵە. هەر هەوڵدانێکیش بۆ شێواندنی ئەم ڕایە وەکو هێرشێك بۆ سەر

کیانی کۆمەڵگا و پێکهاتەکەی دادەنرێ. ئەم ڕایەش کاتێکی زۆر و هەندێجار چەندین سەدە دەخایەنێ.

نمونەی ڕای گشتی هەمیشەیی وەکو هەڵوێستی گەلانی ئیسلامی لە بەرامبەر ئیسرائیل، هەروەها ئەو ڕا گشتییەی بۆ چەندین سەدە لە ئەمریکا و باشوری ئەفریقیا هەبوو سەبارەت بە ڕەش پێستەکان.

### ٣. ڕای گشتی کاتی:

ئەم ڕایە پەیوەستە بە ڕووداوێك یان بەرژەوەندییەکی کاتی تایبەت بە گروپ یان کۆمەڵێکی دیاریکراوە. بە کۆتاییهاتنی ڕووداوەکەش کۆتایی بەو ڕایە دێت. لەبەرئەوە ڕای گشتی کاتی لە زیندوێتی و عەقڵانیەتەوە هێزی خۆی وەردەگرێت و کەمتر کاریگەری دابونەریت و بەها باوەکانی لەسەرە. ئەم ڕایە زۆرتر لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا هەیە.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندی کردن ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە پێکهێنانی ئەم جۆرە ڕایە سەبارەت بە بابەت و پرسێکی دیاریکراو. بەهەمان شێوە پارتە سیاسیەکان و گروپ و دەستەکان هەوڵ دەدەن ڕای گشتی کاتی دروست بکەن سەبارەت بەو ئامانجە کورت خایەنانەی کە هەیانە. بەمشێوەیە ڕای گشتی کاتی وابەستەی هۆکارە کاتی و شوێنیەکانە. لە نمونەی ڕای گشتی کاتی ڕای خەڵکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان سەبارەت بە قەیرانی دارایی جیهانی.

٣. ڕای گشتی ڕۆژانە:

ئەم ڕایە بەهۆی کاریگەری ڕووداوەکانی ڕۆژەوە دروست دەبێت. وەك ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا دەنوسرێت یان ئەو بابەتانەی کە لە گفتوگۆکانی پەرلەماندا قسەیان لەسەر دەکرێت. ڕای گشتی ڕۆژانە پەیوەندی بە ساتێکی دیاری کراوەوە هەیە، هەربۆیە دەتوانین وەکو کاردانەوەیەکی ڕۆژانەی ئەژمار بکەین.

دووەم: (ڕای گشتی بە پێی شوێن):

ئەمیش سێ جۆرە کە بریتین لە:

١. ڕای گشتی ناوخۆیی (ناوچەیی):

مەبەست لێی ئەو ڕایەیە کە لە سنورێکی جوگرافی دیاریکراو وەك پارێزگایەك یان شارێك یان شارۆچکەیەك دروست دەبێت کە گرنگی دەدات بە ڕووداو یان کێشەیەکی ناوچەیی کە ڕایەك لە پێناویدا دروست دەکرێت.

٢. ڕای گشتی نیشتمانی:

بریتیە لەو ڕایەی لەناو زۆرینەی خەڵکی وڵاتێکدا هەیە و بۆ زەمەنێکی دیاریکراو سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو بەردەوام دەبێت و گفتوگۆ و دیالۆگی فراوان لەسەر ئاستی وڵات لەبارەیەوە دەکرێت. ڕای گشتی نیشتمانی کاریگەری کلتور و دابونەریتی بەسەرەوەیە و دەکرێ پێشبینی شێوەی کاردانەوەکانی بکرێت و چارەسەرێکیشە بۆ کێشەکانی نەتەوە.

٤. ڕای گشتی جیهانی (نێودەوڵەتی):

ڕای گشتی جیهانی ئەو ئاراستە و بیرکردنەوانەن کە کاریگەریان لەسەر ڕای چەندین کۆمەڵگە هەیە. کە زیاتر ڕای گەلانە نەك حکومەتەکانیان. بەمەش دەبێتە دیاردەیەکی ڕێکخراو یان ڕێکنەخراو کە بەهۆی کێشەیەکی دیاریکراو لەماوەیەکی دیاریکراودا دروست دەبێت. ئەو کێشەیەش پەیوەندی ڕاستەوخۆ و هەستیارانەی بە بەشێکی بەرچاو لە کۆمەڵگەکانی جیهانەوە هەیە. لە نموونەی ئەم ڕایە ئەو ڕا گشتیانەیە کە دروست دەبن سەبارەت بە بابەتەکانی ئاشتی و ڕەگەزپەرستی و خۆپاراستن لە پیسبوونی ژینگە و برسێتی و هاوکاری کۆمەڵایەتی و ووزە و کێشەکانی گەنجان و چەك داماڵین و بوارە گشتییەکانی ئابووری و تیرۆر.

سێیەم: (ڕای گشتی بە پێی دەرکەوتن):

ڕای گشتی بەپێی دەرکەوتن دوو جۆرە کە بریتین لە:

١. ڕای گشتی ئاشکرا (ڕای سەرکردەکان):

ڕای گشتی لێرەدا بریتیەلە ڕای دەستەبژێر و سەرکردە و نووسەر و زاناکان. ئەمانەش ڕێژەیان کەمە لە کۆمەڵگەدا بەڵام کاریگەریان هەیە لە ڕۆشنبیرکردن و ئاراستەکردنی ڕای گشتی لە بوارە سیاسی و کەلتوری و کۆمەڵایەتییەکان. بەمەش ڕای گشتی لە کۆمەڵگەدا بەپێی بیروبۆچوونی ئەو سەرکردانە دەبرێت بەڕێوە. بەڵام لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا جۆرێك لە کارلێکردن لەنێوان ڕای سەرکردەکان و

ڕای جەماوەردا ڕوودەدات و بەمەش ڕایەکی هاوبەشی لێ دروست دەبێت.

ئەم ڕایە بە ئاشکرا لە کۆمەڵگەدا دەبینرێ هەروەك چۆن پێکهێنەرەکانی ئەم ڕا گشتیە ئامادەن بە تەواوی و بە ئاشکرا ڕای خۆیان نیشانی خەڵکی بدەن.

٢. **ڕای گشتی شاراوە:**

لە دوو لایەنی سەرەکییەوە سەرهەڵدەدات کە بریتین لە:

أ. بەهۆی زەبروزەنگ و سەرکوتکارییەوە هەندێك لە حکومەتەکان ڕێگرن لە پێکهێنانی ڕای گشتی لە کۆمەڵگەکانیاندا، هەربۆیە ئەوانەی کە ڕایەکی جیاوازیان هەیە لەپێناو خۆپاراستن لەو سەرکوتکردنە ئەو ڕایەیان بە شاراوەیی دەهێڵنەوە.

ب. هەندێجار ڕای گشتی شاراوە قەدەغە ناکرێت بەڵام لە ئەنجامی کامڵ نەبوونی ئەو ڕا گشتییەوە بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. بۆ نموونە ئەو ڕا گشتییەی کە لە کاتی جەنگەکاندا سەبارەت بە دروستکردنی ئاشتی هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی جەنگ بەردەوامە لایەنێکی سەرەکی ئاشتی کامڵ نەبووە کە بریتیەلە وەستانی جەنگ هەربۆیە ڕا گشتییەکە بە شاراوەیی دەمێنێتەوە.

چوارەم: (ڕای گشتی بە پێی قەبارە):

ڕای گشتی بەپێی قەبارە پێکهاتوە لە چوار جۆری سەرەکی کە بریتین لە:

١. ڕای گشتی کەمینە:

بریتیەلە ڕای گشتی کەمینەیەك لە خەڵکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو کە سەرەڕای ئەوەی کەمینەن بەڵام گرنگیان لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا هەیە و ناکرێت ڕایان پشتگوێ بخرێت.

هەموو کات ڕای گشتی کەمینە لە نیوەی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو کەمترە. بەڵام ڕەنگە ببێتە ڕای زۆرینە بەتایبەت ئەگەر توانی جەماوەری زیاتر بەلای خۆیدا ڕابکێشێ و گۆڕانکاری لە پرەنسیپەکانیدا بکات.

٢. ڕای گشتی زۆرینە:

ڕای گشتی زۆرینە بریتیەلە ڕای گشتی نیوەی زیاتری کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو کە تیایدا زۆرینە فەرمانڕەوایی دەکات و ئەو خەڵکەش کە لەگەڵیدان پێویستە تێگەیشتن و زانیاری بەرچاویان هەبێ لە وەرگرتنی بڕیارەکانیاندا و هەڵنەخەڵەتێن بە ریکلام و بانگەشە بێ بنەماکان کە ڕەنگە ڕای گشتی زۆرینە بکاتە ڕای گشتی کەمینە.

لە گرنگترین خراپەکانی ڕای گشتی زۆرینە ئەوەیە کە ڕەنگە ببێتەهۆی دروست کردنی تەمەڵی و گوێ پێ نەدان لە لایەن تاکەکانەوە. ڕای گشتی زۆرینە نابێت ڕای گشتی کەمینە پشتگوێ بخات بەڵکو دەبێت بەپێی مبادئە دیموکراسییەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

٢. ڕای گشتی هاوپەیمانێتی:

مەبەست لێی هاوپەیمانێتیکردنە لەنێو ئەو کەمینە جۆراوجۆرانەدا کە لەپێناو دیاریکردنی ئامانجێك و بەدیهێنانیدا کۆدەبنەوە. لەم ڕا گشتییەشدا سەرکردەکان و کەسایەتییە ناسراوەکان ڕۆڵی کاریگەر دەبینن بەتایبەتی لەکاتی دروست بوونی ئەو قەیرانانەی کە وڵات پیایدا تێپەڕ دەبێت.

پارتە سیاسییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کەمینەی کۆمەڵگە پێکدەهێنن هەندێجار لەنێو خۆیاندا هاوپەیمانێتی دروست دەکەن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخێکی دیاریکراو وەك هەڵبژاردن، جەنگ.

٣. ڕای گشتی هەمووان (کۆدەنگی، اجماع):

هەرچەندە دروست بوونی کۆدەنگی لە تەواوی کۆمەڵگەدا کارێکی گرانە، بەڵام هەندێجار بەهۆی عورف و دابونەریت و بیروباوەڕەکانەوە کۆدەنگی سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو دروست دەبێت. بەڵام دروست بوونی ئەم کۆدەنگییە زۆر دەگمەنە.

- **ئەرکەکانی ڕای گشتی:**

ڕای گشتی چەند ئەرکێکی لە ئەستۆدایە و دەبێ جێبەجێیان بکات. بەڵام هەموو ئەو ئەرکانە بەپێی جۆری ڕا گشتییەکە و ئەو کۆمەڵگایەش کە ئەو ڕایەی تیا دروست دەبێ دەگۆڕێت. لێرەدا گرنگترین ئەرکەکانی ڕای گشتی دەخەینەڕوو. کە بریتین لە:

**یەکەم: (ئەرکەکانی ڕای گشتی لە بواری سیاسیدا):**

ڕای گشتی لە بواری سیاسیدا چەند ئەرکێکی لە ئەستۆدایە، وەك:

**١. دیاریکردنی سروشتی کاری سیاسی:**

ئەم دیاریکردنە لە چەند ڕویەکەوە دەبێت:

**أ. کاریگەری لەسەر بڕیاری سیاسی:**

دەسەلآتی گەل لە دەوڵەتە دیموکراتییەکاندا بەرزترین دەسەلآتە. لەبەرئەوە شتێکی بەڵگەنەویستە کە بڕیارە گرنگەکان لەدەوڵەتدا لەلایەن ڕای گشتییەوە پشتگیری و دروست بکرێت. واتە پێویستە چالاکییەکانی حکومەت بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕەنگدانەوەی ڕای گشتی بێت.

**ب. کاریگەری لەسەر هەڵبژاردن:**

لە دەوڵەتە دیموکراتییەکاندا دیاریکردنی سەرکردە و ڕابەرە سیاسییەکان لەڕێی پرۆسەیەکی دەنگدانی بێگەردەوە بەڕێوەدەچێت. ئەم دیاریکردنەش بەشێوەیەکی رووکەشە. واتە پێویستە لە کرۆکدا ڕای گشتی دیاریکەری سەرکردە و فەرمانڕەواکان بێت. هەربۆیە ڕای گشتی کاریگەری لەسەر ڕێژەی دەنگ و شێوەی بەڕێوەچونی پرۆسەی هەڵبژاردن دەبێت.

### ج. کاریگەری لەسەر شێوازی فەرمانڕەوایی کردن:

لــە بەڵگەنەویــستەکانە کــە فــەرمانڕەوا و کاربەدەســتانی حکومــەت دەبێــت نوێنــەری خــەڵك بــن. ڕای گــشتیش گــرنگترین ئەرکــەکانی ئــەم حکومەتە دیاری دەکات کە سەرچاوەی ئەو بەڵێنە گشتی و تایبەتانەیە کــە پــاڵێوراوان بــە خــەڵکی دەدەن. بــەڵام لــەکاتی فەرمانڕەواییکردنــدا دەکرێــت ئــەو بەڵێنانــە دەســتکاری بکرێــت بــەڵام بــەو مەرجــەی لەهــەر دەستکاریکردنێکدا ڕای گشتی بوون و ڕەزامەندی هەبێت.

### ٢. بەدواداچوونی سیاسی:

ڕای گــشتی ســەرەڕای ڕۆڵ و کاریگــەری لــە دیــاریکردنی سروشــتی کــاری سیاســیدا. بــە هــەمان شــێوە ڕای گــشتی کاریگــەری بەرچاویــشی هەیــە لــە بەدواداچــوونی پڕۆســە سیاســییەکان. ئەمــەش بــە جۆرێــك لــە جۆرەکان بۆتە ئەرکێکی سەرەکی ڕای گشتی.

لــە گــرنگترین هــەنگاوەکانی بەدواداچــوونی سیاســی بریتیەلــە لێپرسینەوە لە فەرمانڕەواکان. ئەم لێپرسینەوەیەش لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێت. هەندێکیان لە فەرمانڕەواکان قبوڵی ئەو لێپرســینەوەیە دەکــەن بەوپێیــەی لێپرســینەوە بەشــێکە لــە پڕۆســەی دیموکراسی. بەڵام هەندێکیتر لە فەرمانڕەواکان لە کۆمەڵگاکاندا بەهۆی داخراویان ڕێگە نادەن لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت.

زۆرجار لە دەوڵەتە دیموکراسیەکاندا لێپرسینەوە لە فەرمانڕەواکان و پڕۆسەی بەدواداچوونی سیاسی لەڕێی پەرلەمانەکانەوە دەکرێت. کە لە سەرەتادا پەرلەمان پرسیار ئاراستەی بەرپرسە حکومیەکان دەکات بەمەبەســتی وەرگرتنــی وەڵام ســەبارەت بــە ئــەدا و کــاری دەزگــا

حکومیەکان. ئەگەر پەرلەمان بەو پرسیارانە وەلامی دەست نەکەوت ئەوا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات. ئەگەر لێپرسینەوەکەی پەرلەمانیش بەرهەمی نەبوو ئەوا پەرلەمان لیژنەی بەدواداچوون پێکدەهێنێت. ئەگەر لیژنەی بەدواداچوونیش نەگەیشتە دەرئەنجامێکی ئیجابی ئەوا ئەو پەرلەمانە هەڵدەستێ بە ئیفلیجکردنی حکومەت لە رووی بڕینی دارایی و پەسەندنەکردنی یاسا و بڕیارەکان. ئەگەر ئەمەش نەیتوانی بەرپرسە حکومیەکان ناچار بە چاکسازی بکات ئەوا پەرلەمان متمانە لەو حکومەتە دەسەنێتەوە.

**٣. سەرخستنی پلانەکانی دەوڵەت:**

رای گشتی رۆڵێکی کاریگەری دەبێت لە سەرخستنی ئەو پلانانەی دەوڵەت هەیەتی. هەروەك چۆن دەتوانێ پلانەکانی دەوڵەت پەکبخات. لەبەرئەوە حکومەتەکان هەوڵ دەدەن بە هەموو جۆرێك خەڵك بەشداربێت لە دانانی پلانەکان و جێبەجێ کردنیان. ئەمەش وادەکات سەرکەوتنی پلانەکانی دەوڵەت تارادەیەکی زۆر پەیوەندیدار بێت بە قبوڵکردنی ئەو پلانە لەلایەن رای گشتییەوە.

**٤. دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی سیاسەتی دەرەوە:**

سەرەرای ئەوەی رای گشتی لە ناوخۆدا ئەرکێکی گەورەی لە ئەستۆیە. بەلام لەسەر ئاستی دەرەوەش دەتوانێ رۆڵێکی بەرچاو ببینێت لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی دەرەکی. ئەویش لەرێی ئەو فشارانەی خەڵك و رێکخراو و دەزگا راگەیاندنەکان دەیکەنە سەر حکومەت. هەربۆیە ئەو لایەنەش کە بڕیاری دەرەکی دادەنێ دەبێت رادەی خواستی گەل لەنێو بڕیارەکانیدا جێبکاتەوە. تەنها لەو

حاڵەتـەدا نـەبێت کـە بابەتـەکان زۆر پەیوەندیـدارن بـە دامەزراوەیـەکی تایبەت و بەرژەوەندییە باڵاکانی دەوڵەت وەك (بابەتە سەربازیەکان).

٥. **پشتگیریکردنی تێڕوانینە سیاسییەکان:**

ڕای گـشتی پاڵپـشتێکی سـەرەکییە بـۆ تێڕوانینـە کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکان. سـەرکەوتنی هـەر بیرکردنەوەیـەکیش پەیوەسـتە بـە ڕاددەی پاڵپشتیکردنی ڕای گشتی لێی. بە درێژایی مێژوو ڕای گشتی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە بنیاتنان و پەرەسەندن و پشتگیریکردنی تێـڕوانین و فکـرە سیاسـیەکان. بـەجۆرێك هـەر تێڕوانینێـك پاڵپـشتی زۆرتربوبێ ئەوا ئەو تێڕوانینە زۆرترین دەسەڵاتی پەیدا کردووە.

٦. **نوێگەری سیاسی:**

واتە بەشداریکردنی ڕای گشتی لە پرۆسەی گەشەپێدانی سیاسی کە بریتیەلە بنیاتنان و پەرەپێدان و نوێکردنەوەی پێکهاتەی دامەزراوەیی و دەزگا پێویستەکان کە بتوانێت لەگەڵ بارودۆخی نوێی کۆمەڵگەدا بگونجێـت. ئـەم نوێگەریـە سیاسـیەش لـە چـەند ڕوویەکـەوە سەرهەڵدەدات، لە گرنگترینیان:

أ. سـەرەڕای جیاکردنـەوەی دەسـەڵاتەکانی یاسـادانان و جێبـەجێ کـردن و دادوەری و ڕۆڵـی ئـەم دەسـەڵاتانە لـە پرۆسـەی نوێگـەری سیاسیدا. بەڵام کۆمەڵێك دەزگای تر هەن کە ڕۆڵی نوێ دەبینن وەك (پارتە سیاسیەکان و گروپـەکانی بەرژەوەنـدی و فشار و سـەندیکا و یەکێتییەکان).

ب. بەدیهێنانی یەکسانی لەنێوان هاوولاتیان بەبێ گوێدانە جیاوازیە ئاینی و مەزهەبی و نەتەوەیی و ڕەنگ و زمان و نەژاد و بیکردنەوەو....هتد. هەروەها هەوڵدان بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی یاسایی دوور لە بەکەسێتیکردنی دەسەلات. بەپێچەوانەوە پێویستە ڕۆڵەکان بەپێی لێهاتوویی دابەش بکرێت.

ج. فراوانکردنی بەشداری سیاسی، ئەم بەشداریەش چەمکێکی فراوانە. هەموو پرۆسەیەکی نوێگەری سیاسی پێویستی بە دیاریکردنی ڕاددەی بەشداری سیاسی هەیە. واتە نوێگەری سیاسی بەدی نایەت بەبێ بەشدارییەکی سیاسیانەی کارا و چالاك.

د. بەهێزی کار و ئەدای سستەمی سیاسی. واتە بۆ هەموو گەشەپێدانێکی سیاسی پێویستمان بە سیستەمێکی سیاسی بەهێز هەیە. هیچ سیستەمێکی سیاسیش بەهێز نابێت بەبێ پاڵپشتیکردنی ڕای گشتی لەو سیستەمە.

٧. پاراستی ڕۆحی مەعنەوی:

بریتیەلە گرنگیدانی تاکەکانی کۆمەڵ بە بابەتێکی چارەنووسساز و یەکلاکەرەوە وەك گرنگیدان بە پاراستنی هەستی نەتەوایەتی بۆ ماوەیەکی دورودرێژ یان پاراستنی هەستی ڕەگەزپەرستی یان پاراستنی هەستی سەربەخۆیی بۆ کاتێکی دورودرێژ.

ڕای گشتی ئامرازێکی سەرەکی پارێزگاریکردنی ڕۆحی مەعنەوییە. واتە ئەوانەی کە پارێزگاری لە هەستی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی و ڕەگەزپەرستی و ئاینی و فکری دەکەن بریتین لە ڕای گشتی.

٨. دەرکردن و پەسەندکردنی بڕیارەکان:

لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا ڕای گشتی پێگەیەکی بەرچاوی هەیە لە داڕشتن و دەرکردن و پەسەندکردنی بڕیارەکان. تەنانەت لە هەندێ کۆمەڵگەدا یاساکان پڕاوپڕ دەربڕی خواستەکانی ڕای گشتین کە تیایدا ئەو یاسایانە پاڵپشتی لە سیاسەت و بەها باوەکان و پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن.

**دووەم: (ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی ڕای گشتی):**

لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی ڕای گشتی سێ ئەرکی سەرەکی لە ئەستۆدایە، کە بریتین لە:

١. **پەرەپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتی:**

بەرەوپێشبردنی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی لە ئەرکە سیاسیەکانی ڕای گشتیە کە لە ڕێیەوە دەتوانرێ گۆڕانکاری بکرێت لە تێڕوانین و بارودۆخ و چالاکی و یاساکان یان هەموارکردنی ئەو حاڵەتەی کە پێویستی بە گۆڕانکارییە و پاراستنی ئەو بارودۆخەش کە لە بەرژەوەندی گشتییە. ئەمەش لەڕێی کاریگەری ڕای گشتیەوە بەدی دەکرێت.

پەرەپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە گەشەپێدانی ئابوورییەوە. چونکە پێشکەوتنە ئابوورییە گرنگەکان

بونەتـەهۆی هێنانـەدی خۆشـگوزەرانی و ئاسـودەییەکی بەرچـاو لـە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکاندا.

**٢. چاودێری کۆمەلایەتی:**

واتە پارێزگاریکردن لە دابونەریت و بەها باڵاکانی کۆمەڵگە. ئەمەش لـەرێی بەرەنگاربوونـەوەی هـەر چالاکی و تێروانینێك کە ببێتەمایـەی دژایەتیکردنی ئەو دابونەریتانە. لەبەرئەوە ڕای گشتی بە هیچ جۆرێك ڕێگە نادات نێگەتیڤ (سلبی) لە بەهاکانی کۆمەڵگەدا رووبدات. بەڵام ئەگەر گۆڕانکارییەکە پۆزەتیڤ (ئیجابی) بوو ئەوا بەو جۆرەی کە لەگەڵ بەرەوپێشبردن و کرانەوەی پۆزەتیڤانەی کۆمەڵگەدا بگونجێ ئەوا ئەو کاریگەری و گۆڕانکاریە قبوڵ دەکرێت.

**٣. جۆشدان:**

ڕای گـشتی لـە کۆمەڵگەکانـدا کاردەکـات لـەپێناو سەرخـستنی پلانەکانی دەوڵـەت و گەشەپێدانی سیاسـی و ئابووری. هـەروەك چۆن دەتـوانێ کاربکـات بـۆ پەککخـستنی ئـەو پلانانـە. لەبەرئـەوە حکومەتـە پێشکەوتوەکان هەوڵ دەدەن هاووڵاتی لە دارشتنی یاساکان و پلانەکان دا بەشـداربن، چـونکە بـە بەشـداربوونیان ئاسـتی پابەنـدبوونیان بـەو پلانانـەوە زیـاد دەبێـت. ئـەم بەشـداری کردنـە پێویـستی بـە ڕۆڵێکـی کاریگـەری حکومـەت هەیـە. چـونکە دەتـوانێ کاریگـەربێت لـە هاندانی خەڵك بۆ بەشداریکردن.

بـۆ ئـەوەی خـەڵك بـە باشـترین شـێوە بەشـداربێ پێویـستە ئاگـاداری بارودۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایـەتی بێـت. وەك ئاشـکراکردنی

زانیارییەکان و تێگەشتنیان لەو سیستەمە ئابوورییەی لە وولآتدا پەیڕەو دەکرێت.

- **ڕووخسارەکانی ڕای گشتی:**

ڕای گشتی چەند رووخسارێکی هەیە کە بریتین لە:

**یەکەم: ڕووخسارە پۆزەتیڤەکان( ئیجابییەکان ):**

ئەمەش چەند جۆرێکە:

**١. شۆڕش:**

ڕەفتارێکی توندوتیژانەیە بۆ دەربڕینی ڕای گشتی، لەوکاتەدا سەرهەڵدەدات کە ئەوە بۆ خەڵك ڕوون بێتەوە کە دەربڕینە زارەکیەکان دەرئەنجامی باشیان نابێ لە بەدیهێنانی خواست و هیواکانیان. واتە ئەوکاتەی کە دەسەلآت لە دۆڵێکەو خەڵکیش لە دۆڵێکیتر.

**٢. خۆپیشاندانە گشتییەکان:**

لەکاتێکدا ڕوودەدەن کە کێشەیەکی گشتی پەیوەندیدار بە گەلەوە ڕوودەدات کە مەبەست لێی ئاگادارکردنەوەی سەرکردە و حکومەتەکانە لە خواست و بۆچوونەکانی خەڵك سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە.

هەندێك لە حکومەتەکانی جیهان ڕێگە دەدەن بە ئەنجامدانی خۆپیشاندان وەك ئامرازێکی دیموکراسی بۆ دەربڕینی ڕای گشتی لە بەرامبەریشدا حکومەتە دیکتاتۆرییەکان ڕێگە نادەن خەڵك

خۆپیشاندان ئەنجام بدات و بە مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتەکانیان دادەنێن.

٣. دروستکردنی پڕوپاگەندە:

پروپاگەندە واتە گێڕانەوەیەك کە لەناو خەڵکدا دەگوازرێتەوە بەبێ ئەوەی سەرچاوەیەکی سەرەکی و دروستی هەبێ و پشتڕاست بکرێتەوە. ئەمەش لەکاتێکدا ڕوودەدات کە خەڵك هیچ ڕێگایەکی تری نەبێ بۆ دەربڕینی ڕای گشتی بە مەبەستی دروستکردنی بێ متمانەی لەناو حکومەت دا.

٤. کۆبونەوە گشتیەکان:

هەندێجار ڕای گشتی پەنا دەباتەبەر کۆبونەوە گشتیەکان بۆ دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆی لەپێناو دروستکردنی دەرەنجامێکی گشتی کە ڕاسپاردە و بۆچوونەکانی خەڵك بگەیەنێتە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەواکان.

٥. بەکارهێنانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن:

لە دەوڵەتە دیموکراتیەکاندا دەزگا ڕاگەیاندنەکان ئامرازێکی سەرەکی دەربڕینی خواست و ئاراستەی بیرکردنەوەکانی خەڵکن. تەنانەت ئەو دەزگایانە دەتوانن ببنە پێکهێنەرێکی ڕای گشتی. بەڵام بەپێچەوانەوە لە دەوڵەتە دیکتاتۆریەکاندا دەزگا ڕاگەیاندنەکان لە دەست حکومەتە دیکتاتۆریەکاندا قۆرخکراون.

٦. هەڵبژاردن:

دیارترین و زیندووترین و یاساییترین ڕێگای دەربڕینی ڕای گشتییە کە تیایدا لەڕێی سندوقەکانی دەنگدانەوە هاووڵاتیان فەرمانڕەواکانی دەوڵەت بە ویست و ئیرادەی خۆیان دیاری دەکەن.

٧. نامەی پشتگیری و نارەزایی:

لەم رووخسارەدا کۆمەڵێك خەڵك لەسەرئاستی ناوچەیەکی دیاریکراو نووسراوێکی پشتگیری یان نارەزایی پێشکەش بە لایەنێکی دیاریکراو دەکەن کە زۆربەی جار ئەو لایەنە فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە دەکات. هەندێجاریش لەگەڵ ئەو نامانەدا ئیمزای خەڵکی هاوپێچ دەکرێت.

دووەم: رووخسارە نێگەتیڤەکان (سلبیەکان):

ئەمانەش چەند جۆرێکن:

١. دابڕان:

مەبەست لێی دوورکەوتنەوە لە بەشداریکردن و دەربڕینی ڕای گشتییە. ئەگەرچی شێوازێکی پەیرەو کراوە بەڵام لەڕاستیدا بە لایەنێکی نێگەتیڤ ئەژمار دەکرێت. چونکە لەڕێی ئەو دابڕانەوە خەڵك ناتوانێت هیچ لە هاوکێشەکانی کۆمەڵگەدا بگۆڕێت.

٢. مانگرتن لە کار:

ئەگەرچی یەکێکە لە ڕووخسارە پەیرەوکراوەکان، بەڵام دەرەنجامێکی نێگەتیڤی لێدەکەوێتەوە، چونکە لە ڕاوەستانی ئەو

کارەدا خەڵکێك هەن زەرەرمەند دەبن بەتایبەت ئەگەر ئەو کارە پەیوەندی بە ژیانی بەشێکی زۆر لە خەڵکەوە هەبێت.

- **پێکهێنەرەکانی ڕای گشتی:**

چەندین بابەتی گرنگ هەن کە رۆڵێکی بەرچاو و کاریگەر دەبینن لە پێکهێنانی ڕای گشتیدا. لە گرنگترین ئەو پێکهێنەرانەش:

**١. دابونەریت:**

گەلان بە دابونەریت و بەها باڵاکانیان دەناسرێنەوە کە ئەم دابونەریتانە کاریگەرییەکی فراوانی لەسەر داڕشتن و پێکهێنانی ڕای گشتی هەیە. بەجۆرێك ئەگەر لە دابونەریتی نەتەوەکاندا کرانەوە هەبێت ئەوا گریمانەی پێکهێنانی ڕای گشتی بە ئازادانە لەو کۆمەڵگەیەدا زیاد دەکات. بەڵام بەپێچەوانەشەوە ئەو کۆمەڵگایانەی خاوەنی دابونەریتێکی داخراو و سەرکوتکەرانەن ئەوا ڕای گشتی تیاندا کامڵ نابێت.

**٢. ئاین:**

بەهۆی ئەوەی لە سەرەتای دروستبونی مرۆڤایەتیەوە ئاین هەبووە، هەربۆیە لە پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا ڕەنگی داوەتەوە. هەندێجار پیاوانی سیاسەت ئاینیان کردۆتە میکانیزمێك بۆ هۆشیار کردنەوەی تاك یاخود بۆ چەوساندنەوەی تاك. لەئەنجامدا دوو جۆرە مرۆڤی لێ بەرهەم هاتووە یەکێکیان مرۆڤێکی بیرفراوان ئەویتریان مرۆڤێکی بیرتەسك.

٣. دامەزراوەكانی پێگەیاندن:

خێزان و قوتابخانە و پەیمانگا و زانكۆكان كۆمەڵێك دامەزراوەی پەروەردە و پێگەیاندن و فێركردنن كە كاریگەرییان لەسەر پرۆسەی سیاسی و ژیانە گشتییەكانی كۆمەڵگە هەیە و دەتوانن ڕای گشتی لە وولاّتدا بە ئاراستەی بەهێزیدا دابڕێژن. بەلاّم لە كۆمەڵگە دیكتاتۆریەكاندا پرۆسەی پێگەیاندن و فێركردن وابەستەی عەقڵیەتی دیكتاتۆرییانەی فەرمانڕەواكانە. هەربۆیە بە ئاشكرا دەبینرێ ئەو دامەزراوانە ئەركی خۆیان نابینن.

٤. ڕووداو و كێشەكان:

ڕووداو و كێشەكان یەكێكن لە گرنگترین پێكهێنەرەكانی ڕای گشتی كە هەندێجار ڕایەكی گشتی كاتی دروست دەكەن، وەك ئەو ڕا گشتییەی لەكاتی ئەو كێشانەی كە لەنێوان كرێكاران و خاوەن كارگەیەكدا ڕوودەدات. یان هەندێجار ڕایەكی گشتی هەمیشەیی دروست دەكات، وەك لە حاڵەتی ڕوودانی قەیرانە سیاسی و ئابورییەكان و بومەلەرزە و شۆڕش و جەنگ....هتد، دروست دەبێت.

٥. سەركردەكان:

فەرمانڕەوا و سەركردەكان دەتوانن ڕای گشتی ئاراستە بكەن، بەلاّم ئەم ئاراستەكردنە لە كۆمەڵگەیەكەوە بۆ كۆمەڵگەیەكی تر دەگۆڕێت. لە كۆمەڵگە پێشكەوتووەكاندا سەركردەكان تەنها دەتوانن بەشداربن لە پرۆسەی هۆشیاركردنەوەی خەڵك بەلاّم لە كۆمەڵگە دواكەوتووەكاندا

سەرکردەکان ڕۆڵێکی فراوانتر دەبینین و دەبنە نوێنەر و دەربڕی ڕای گشتی.

٦. بارودۆخی سیاسی:

ڕای گشتی بەپێی بارودۆخە سیاسیەکان گۆڕانکاری بەسەردادێت و هەر ئەم ڕایە لە ئەنجامی گۆڕانکاری بارودۆخەکانەوە پێکدێت. هەرکاتێك سیستمی سیاسی سیستەمێکی فرەیی بوو ئەوا ڕای گشتی بەشێوازێکی بەهێز لە کۆمەڵگەدا دەردەکەوێت و بەپێچەوانەشەوە ئەگەر سیستەمەکە داخراو (تۆتالیتاری) بوو ئەوا ڕای گشتی کەمتر دروست دەبێت، یان لە دروستبوونیدا سەرکوت دەکرێت.

٧. بارودۆخی نێودەوڵەتی:

هەمیشە پێکهێنانی ڕای گشتی وابەستەی بارودۆخە نێودەوڵەتییەکانە. هەرکاتێك ئەو دۆخە نێودەوڵەتییە کاریگەری ئیجابی لەسەر ناوخۆی کۆمەڵگەکان هەبێ، ئەوا ئاڕاستەی ئەو ڕا گشتیەی لە کۆمەڵگەدا دروست دەبێ ئاراستەیەکی پۆزەتیڤانەیە. بەڵام ئەگەر دۆخی نێودەوڵەتی مەترسیدار بوو بۆ ناوخۆی وڵات ئەوا ڕای گشتی ئەگەر پێك بێت لاوازە.

٨. دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندیکردن:

وەك لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەبینین دەزگاکانی ڕاگەیاندن لایەنێکی کاریگەرن لە پێکهێنانی ڕای گشتی کە دەتوانن بەپێی ویستی دەزگاکان ئاراستەی بیرکردنەوەی هاووڵاتیان دابڕێژن. زۆرجار

کاریگەری دەزگاکانی راگەیاندن، بەتایبەتی دەزگا بینراوەکان، لەسەر دروستبوونی رای گشتی تۆکمەتر دەبێت.

- **ڕێگاکانی گۆڕینی ڕای گشتی:**

هەمیشە لە کۆمەڵگەکاندا پارتە سیاسییەکان کاردەکەن لەپێناو گۆڕینی ڕای گشتی بەپێی ئەو سیستەم و بیرکردنەوەیەی کە خۆیان پەسەندی دەکەن. لەم پێناوەشدا چەندین ڕێگە هەیە بۆ گۆڕینی ئەو ڕا گشتییەی لە کۆمەڵگەیەکدا هەیە. لە گرنگترینیان:

**١. نیشاندانی ڕاستییەکان:**

نیشاندانی ڕاستییەکان دەروازەیەکی سەرەکییە بۆ گۆڕینی ڕای گشتی بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕاستییانە بگاتە زۆرترین ڕێژە لە خەڵك بە مەرجێك ئەو ڕاستییانە لەگەڵ واقیعدا بگونجێت. گرتنەبەری ئەم ڕێگایەش لەکاتێکدا سەرکەوتوو دەبێت کە جەماوەر ئامادەیی تیادا بێت بۆ گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن و باوەڕهێنان.

**٢. پرۆگرام و لێدوانی پۆزەتیڤانە:**

زۆرجار لە کاتی بوونی ڕایەکی گشتی دیاریکراو لە کۆمەڵگەیەکدا سەبارەت بە مەسەلەیەکی پەیوەندیدار بە خەڵکەوە لێدوانی بەرپرسێك یان نیشاندانی پرۆگرامێکی ئیجابی دەتوانێت ڕای خەڵکی بگۆڕێت. بەتایبەت ئەگەر خەڵك بڕوای بەو لێدوانە و بەو پرۆگرامە هەبێت و لەنێو لێدوانەکانیشدا کۆمەڵێك بەڵێن بە خەڵکی بدرێت. پیاوانی سیاسەتیش زیاد لە هەموو کەس گرنگی لێدوانە ئیجابیەکان دەزانن،

لەبەرئــەوە زۆرتــرین بــەکارهێنانی ئــەم لێدوانانــە لەلایــەن پیــاوانی سیاسەتەوەیە.

٣. دووبارەکردنەوە:

یەکێکە لە سەرکەوتووترین ڕێگاکانی گۆڕینی ڕای گشتی، بۆ نموونە کاتێـک دەقـی وتارێـک لـە دەزگایـەکی ڕاگەیاندنـەوە بـۆ چـەند جارێـک دووبارە دەکرێتەوە یان بە مانایەکیتر هەمان دەق دادەڕێژێتەوە، ئەوا زیاتر کاریگەری کرۆکی وتارەکە دەردەکەوێت. لە گرنگترین دەرئەنجامە ئیجابیەکانی دوبارە کردنەوە بریتیەلە گەیشتنی ئەو بابەتە بە زۆرترین ڕێژەی خەڵك و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن و لەبەرکردنی ئەو وشە و وتانەی بەکاردەهێنرێت.

٤. وروژاندنی هەست و سۆز:

لـەم شێوازەدا جـەخت دەکرێتـەوە لەسـەر قسـەکردن لەگـەڵ سـۆز و ویژدانــدا. زۆرجــار لــەم شــێوازەدا هەڵخەڵەتانــدن و سەرلێــشێواندن و ناڕاستی بەکاردەهێنرێ، ئەمـەش لە پێنـاو گەیـشتن بـە ئامانجەکان. لە نمونەی ئەم حاڵەتە زۆر بەدی دەکرێت کاتێك سـەرکردەکان دەیانەوێت خەڵك لەڕێی وروژاندنی بواری سۆزدارییەوە ڕایان بگۆڕێت.

٥. ترس:

بەکارهێنانی ترس و دڵەڕاوکێ لەلایەن حکومەت و هێز و سیستەم و پارتە سیاسییەکانەوە بۆ گۆڕینی ڕای گشتی حاڵـەتێکی پـەیڕەوکراوە، بەتایبەت لە کاتی خۆپیشاندان و هەڵبژاردنەکانـدا کـە پـەنا دەبرێتەبـەر

ترساندنی خەڵك بۆ بەشداری نەکردنی خەڵك لەو خۆپیشاندانەدا یان بۆ گۆڕینی ئەو دەنگەی کە خەڵك دەیدات.

ئەم شێوازانە زیاتر دەچنە خانەی شێوازە نێگەتیڤەکان کە تیایدا لەڕێی بەکارهێنانی توندوتیژی یان هەڵخەڵەتاندن ڕای گشتی دەگۆڕێت. هەربۆیە زیاتر لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا پەیڕەو دەکرێت.

# سەرچاوەكان

**یەكەم: كتێب:**

**أ. كتێبی عەرەبی:**


١. ابراهيم نافع و اخرون ، رؤية عالمية لمستقبل الشرق الاوسط، القاهرة، مركز الاهرام، ١٩٩٢

2. د. احمد وهبان ، التخلف السياسي و غايات التنمية، القاهرة، ٢٠٠٠

3. احمد بدر، الراي العام، الكويت، وكالة المطبوعات، ١٩٨٢.

٤. د.ارسلان شرف الدين، مدخل لدراسة الاحزاب السياسية العربية، بيروت، دار الفارابي، ٢٠٠٦.

٥. د.اسامة الغزالي حرب، الاحزاب السياسية في العالم الثالث، الكويت، المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الآداب، عالم المعرفة، ١٩٨٧.

6. د.اسامة عبد الرحمن، المأزق العربي الراهن هل الى خلاص من سبيل، مركز دراسات الوحدة العربية ، بيروت ، ١٩٩٩

٧. المعهد الوطني الديمقراطي، الأحزاب السياسية و الانتقال إلى الديمقراطية، مراجعة و تحقيق: مي الأحمر، بيروت، ٢٠٠٤.

٨. إيمان محمد محسن، وظائف الأحزاب السياسية في نظم التعددية المقيدة دراسة حالة التجمع في مصر، القاهرة، عن مؤسسة الأهالي، ١٩٩٥.

9. برهان غليون و آخرون، حول الخيار الديمقراطي-دراسة نقدية-، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٤.

10. بلقيس احمد منصور، الأحزاب السياسية و التحول الديمقراطي -دراسة تطبيقية على اليمن وبلاد أخرى-، مكتبة مدبولي ، الطبعة الاولى، القاهرة، ٢٠٠٤.

١١. توماس فريدمان، العالم مسطح، بيروت، دار الكتاب العربي، ٢٠٠٦

12. ثناء فؤاد عبدالله، آليات التغيير الديمقراطي في الوطن العربي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧.

١٣. جابرييل إيه الموند، جي بنجهام باويل الابن: السياسات المقارنة في وقتنا الحاضر، ترجمة هشام عبدالله، مراجعة سمير نصار، عمان، الأهلية للنشر و التوزيع، ترجمة الطبعة الخامسة، ١٩٩٨

١٤. جوديث س.يافيه، الشرق الاوسط عام ٢٠١٥من منظور الامريكي، ترجمة احمد رمو، دار علاءالدين، سورية،٢٠٠٥

١٥. جيرالد م.بومبر، مفاهيم الاحزاب السياسية للديمقراطية الامريكية، ترجمة: محمد نجار، دار النسر للنشر والتوزيع، عمان-الاردن، ١٩٩٩.

16. حسين جميل، نشاة الاحزاب السياسية، بيروت-لبنان، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الاولى، ١٩٨٤.

17. د.حورية توفيق مجاهد، نظام الحزب الواحد في افريقية بين النظرية و التطبيق، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية، ١٩٧٧.

١٨. خضر طارق فتح الله، دور الأحزاب السياسية في النظم النيابية دراسة مقارنة، القاهرة، دار نافع، ١٩٨٦.

١٩. د.عبدالهادي الجوهري، المشاركة السياسية للمرأة و قوى التغيير الاجتماعي، القاهرة، ١٩٨٩

٢٠. عبدالوهاب كحيل، الراي العام و السياسة الاعلامية، القاهرة، مكتبة المدينة، ١٩٨٧.

٢١. عبدالوهاب ابراهيم، معوقات التنمية في العالم الثالث، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٨٤

٢٢. الدكتور عبدالرزاق عيد و محمد عبدالجبار، الديمقراطية بين العلمانية و الإسلام ، الطبعة الاولى، دار الفكر المعاصر، بيروت، ٢٠٠٠.

٢٣. علي الدين هلال، د.نيفين مسعد، النظم السياسية العربية قضايا الاستمرار و التغيير، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الأولى، ٢٠٠٠

٢٤. علي خليفة الكواري و آخرون، المسألة الديمقراطية في الوطن العربي، الطبعة الاولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٠.

٢٥. عمل جماعي، الأحزاب السياسية في العالم العربي، بيروت، المركز اللبناني للدراسات، الطبعة الأولى /٢٠٠٦.

٢٦. كريم أحمد كشاكش، الحريات العامة في الأنظمة السياسية المعاصرة، منشأة المعارف، الإسكندرية، ١٩٨٧.

٢٧. سعاد الشرقاوي، النظم السياسية في العالم المعاصر، دار النهضة العربية، الطبعة الثانية، القاهرة، ١٩٨٢.

٢٨. سرهنك حميد البرزنجي، انتخابات اقليم كردستان العراق بين النظرية و التطبيق، مؤسسة موكرياني للطباعة و النشر، اربيل، ٢٠٠٢

٢٩. سليمان تقي الدين ، تحولات المجتمع و السياسة، دار الحداثة، ١٩٩٢

٣٠. سوزان كالفرت و بيتر كالفرت، السياسة و المجتمع في العالم الثالث، ترجمة د.عبدالله بن جمعان، جامعة الملك سعود، ٢٠٠٢

٣١. د.صادق الاسود، علم الاجتماع السياسى، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، جامعة بغداد/كلية العلوم السياسية، ١٩٩٠.

٣٢. صالح جواد الكاظم و علي غالب العاني، الأنظمة السياسية، مطبعة دار الحكمة، بغداد، ١٩٩١.

٣٣. صلاح الخرسان، صفحات من تأريخ العراق السياسي الحديث "الحركات الماركسية" ١٩٢٠-١٩٩٠، مؤسسة العارف للمطبوعات، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠١.

٣٤. طارق المجذوب، الإدارة العامة، كلية الحقوق جامعة بيروت العربية، منشورات الحلبي الحقوقية، ٢٠٠٣.

٣٥. د.طارق علي الربيعي، الاحزاب السياسية، وزارة التعليم العالي، جامعة بغداد، ١٩٩٠.

٣٦. د.طاهر محسن منصور، الادارة الاستراتيجية منظور منهجي متكامل، دار وائل، الاردن، ٢٠٠٧

٣٧. طه رمضان و اخرون، مشكلات و تجارب التنمية في العالم الثالث، دار الحكمة، بغداد، ١٩٩٠

٣٨. كمال المنوفي، أصول النظم السياسية المقارنة، شركة الربيعان للنشر والتوزيع، الكويت، ١٩٨٧.

٣٩. رعد ناجي الجدة، تشريعات الجمعيات و الأحزاب السياسية في العراق، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢.

٤٠. روبرت ماكيفر، تكوين الدولة، ترجمة: حسن صعب، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٦.

٤١. روبرتو ميشال، الاحزاب السياسية (دراسة سوسيولوجية)، ترجمة: منير مخلوف، الطبعة الاولى، بيروت، دار ابعاد للطباعة و النشر والتوزيع، بلا سنة طبع.

٤٢. محمد عبدالملك المتوكل، مدخل الى الاعلام و الراي العام، الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٩١.

43. د.محمد منير حجاب، أساسيات الراي العام، دار الفجر للنشر و التوزيع، مصر، ١٩٩٨.

٤٤. موسى خميس، دراسات في التخطيط و التنمية، دار حسنين، عمان، ١٩٩٥

٤٥. د.موسى اللوزي، التنمية الادارية، دار وائل، الاردن، ٢٠٠٢

٤٦. موريس دوفرجيه، الاحزاب السياسية، ترجمة: علي مقلد و عبدالحسن سعد، بيروت، دار النهار، ١٩٨٠.

٤٧. موريس دوفرجيه، المدخل إلى علم السياسة، ترجمة: جمال الأتاسي و سامي الدرزي، دار دمشق، سوريا، ١٩٦٥.

48. ناهد رمزي، الراي العام و سيكولوجية السياسة، القاهرة، الانجلوالمصرية، ١٩٩١.

ب. كتێبی کوردی:

١. د. حوجەتەلا ئەیووبی، سەرهەڵدان و بەردەوامیی حیزبە سیاسییەکان لە ڕۆژئاوا، وەرگێڕانی -ئازاد وەڵەد بەگی- دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٢. د.هانی ئەلرەزا و د.رامز عەممار، ڕای گشتی و ڕاگەیاندن و بانگەشەکردن، وەرگێڕانی ئەحمەد سەلام، خانەی وەرگێڕان.

**دووەم: گۆڤار و ئەنتەرنێت:**


١. ابو ياسر: دراسة مبسطة عن الحزب السياسي، ٢٠٠٧، مصدر من الانترنت على الموقع: www.al7our-maktoobblog.com

٢. بثينة عبدالله: الحزب و السياسة و الديمقراطية، الجزيرة نت، ٢٠٠٣، مصدر من الانترنت على الموقع: www.aljazeera.net

٣. تقرير المجتمع المدني و التحول الديمقراطي في الوطن العربي لعام ٢٠٠٤، الصادر عن مركز ابن خلدون (العراق) من الانترنيت: www. Metransparent.com

٤. حسين درويش العادلي، رسالة في قضايا المرأة، مجلة المستقبل العربي، عدد خاص، ابريل ٢٠٠٤.

٥. علي خليفة الكواري، مفهوم الحزب الديمقراطي...ملاحظات اولية، مجلة المستقبل العربي، العدد ٢٩٦، بيروت، ٢٠٠٣

٦. صلاح نيوف: نظرية الأحزاب السياسية، الحوار المتمدن، العدد ١٢٥٤، ٢٠٠٥/٧/١٠. مصدر من الانترنت على الموقع: www.rezgar.com

٧. يحيى الوزكاني، المشاركة السياسية للمرأة في ضوء المواثيق الدولية لحقوق الانسان، مصدر مقال من الانترنت بتاريخ ٢٠٠٧/٤/٢١ و على الموقع: http://www.pcwesr.org



**ڕێبوار کەریم مەحمود**

* لە ساڵی ١٩٨١ لە شارۆچکەی پێنجوێن لەدایك بووە.
* ساڵی ٢٠٠٣ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەستهێناوە لە کۆلێجی یاسا و رامیاری-بەشی زانستە رامیارییەکان-زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر
* ساڵی ٢٠٠٦ بڕوانامەی ماستەری بەدەستهێناوە لە کۆلێجی زانستە رامیارییەکان-بەشی سیاسەتی نێودەوڵەتی-زانکۆی بەغداد
* کتێبێکی لەژێر ناوونیشانی (پەیوەندییەکانی عیراق-ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٩ و ئاسۆکانی داهاتووی) بە زمانی عەرەبی بڵاوکردۆتەوە.
* لەبوارەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا چەندین بڵاوکراوە و وانەی هەیە.
* خوێندکاری دکتۆرایە لە کۆلێجی یاسا و رامیاری-بەشی زانستە رامیارییەکان-زانکۆی سلێمانی
* ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی-کۆلیجی زانستە رامیاری و کۆمەڵایەتییەکان/چەمچەماڵ-بەشی زانستە رامیارییەکان